لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی
ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرەی کتێب: **(١٦٠)**

# سەفەری بوتڵە بەتاڵەکان

## قادر عەبدوڵڵا

سەلاحەدین بایەزیدی
لە فەرەنسییەوە کردوویە بە کوردی


- بەرگ: باسم ڕەسام
- نەخشەسازیی ناوەوە: ئاوات کەریم مستەفا
- ڕێنووس و هەڵەچنی: لاوک ئەبوبەکر
- چاپ: یەکەم
- چاپخانە: تاران- پەنجەرە
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: (٥٠٠٠) دینار
- بڵاوکار: ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(١٨٤٦)ی ساڵی(٢٠١٦)ی پێ دراوە


سلێمانی- مەیدانی پاسەکانی تووی مەلیک- نهۆمی زەمینی بازاڕی کتێب
ژمارەی تەلەفۆن: ٠٧٧٠٣٥٧٣٧٥٧

# سەفەری بوتڵە بەتاڵەکان

قادر عەبدوڵڵا

سەلاحەدین بایەزیدی
لە فەڕەنسییەوە کردوویە بە کوردی

چاپی یەکەم
٢٠١٦

**حسێن سەجادی قائیمەقامی فەراهانی**، ناسراو بە **قادر عەبدوڵلا**، ساڵی ١٩٥٤ لە شاری **ئەراک**ی وڵاتی **ئێران** لەدایک بووە. ساڵی ١٩٨٨ ڕۆیشتووەتە وڵاتی **هۆڵەندا** و پاش فێربوونی زمانی هۆڵەندی بەو زمانە نووسیویەتی و لەمڕۆدا یەکێکە لە نووسەرە هەرە ناسراوەکانی **هۆڵەندا**. **قادر عەبدوڵلا** بە هۆڵەندی دەنووسێت و بەرهەمەکانی بۆ گەلێک زمان وەرگێڕدراون، بەڵام کتێبەکانی لە **ئێران** قەدەغەن و تا ئێستا هیچ کتێبێکی وەرنەگێڕدراوەتە سەر زمانی دایکی.

نووسەر نازناوی **قادر عەبدوڵلای** لە ناوی دوو شۆڕشگێڕی کوردی هاوڕێی وەرگرتووە، کە لە لایەن **ڕژێمی ئێران**ەوە لەسێدارە دراون. لەم بارەوە لە وتووێژێکدا بە **ڕادیۆ فەردای** گوتووە: "بەردەوام ویستوومە نووسەرێکی گەورە و باشی **ئێران** بم، بەڵام گرفتێکم هەبوو، ئەویش پاشناوی باوکی باوەگەورەم بوو، **میرزا ئەبولقاسم قائیمەقامی فەراهانی**، چەندەشم نووسیبا، دیسان هەر ئەو گەورەتر بوو. ئەگەر ناوی خۆم کردبایە **قائیمەقامی فەراهانی**، بەردەوام ئەو

**قائیمەقامە فەراهانی**یەی دی قورستر بوو. هەمیشە ئەو کێشەیەم هەبوو و نەمدەزانی بە چ شێوەیەک چارەسەری بکەم. کە یەکەم کتێبم لە ژێر چاپ بوو بە دووی ناوێکدا دەگەڕام، بە داخەوە دوو هاوڕێم ڕێک لەو ڕۆژانەدا لە سێدارە دران، یەکێکیان ناوی **قادر** و ئەوی تریان **عەبدوڵلا** بوو. بیرم کردەوە ئەگەر ناوی ئەو دوو هاوڕێیە لە پاڵ یەکتری دابنێم، دەبمە **قادر عەبدوڵلا**."

**قادر عەبدوڵلا** لە **ڕۆژنامەی کاری** زمانحاڵی **ڕێکخراوی چریکەی فیداییەکان** دەستی بە نووسین کردووە و بە شێوەیەکی نهێنی، دوو کتێبی بە ناوەکانی **کوردەکان دەڵێن چی؟** و **کوردستان پاش بزاڤی خۆڕاگری** چاپ و بڵاو کردووەتەوە.

**قادر عەبدوڵلا** پاش لە سێدارەدانی ئامۆزاکەی **ئێران**ی جێ هێشتووە و ئێستا لە **هۆڵەندا** دەژی، گۆشەنووسی یەکێک لە کۆنترین و پڕتیراژترین ڕۆژنامەکانی هۆڵەندایە بە ناوی **فالکس کرانت**.

هەندێک لە کتێبەکانی **قادر عەبدوڵلا** بریتین لە **کوردەکان دەڵێن چی؟، کوردستان پاش بزاڤی خۆڕاگری، کچە گەنجەکان و پارتیزانەکان، سەفەری بوتڵە بەتاڵەکان،ماڵەکەی مزگەوت، پێغەمبەر، پاشا.**

**قادر عەبدوڵلا** ئێستا لە وڵاتی **هۆڵەندا** دەژی.

## ١

فرۆکەیەک، ئێستاکە فرۆکەیەکە خۆ بە خەونەکانمدا دەکا. جاران کۆمەڵێک شەمەندەفەر لە نێو خەونەکانمدا دەیانفیشکاند، ژمارەیان زۆر بوو و دەبوونە هۆکاری ئەوەی مۆتەکە بەسەرمدا زاڵ بێ.

شەمەندەفەرەکان دەهاتن و دەچوون، ئەوان کۆمەڵێک ڕێبواریان بۆ دەهێنام و بە بەتاڵی دەگەڕانەوە.

ئێستا شەمەندەفەرەکان بێسەروشوێن بوون. دوایین شەمەندەفەر **ڕۆنی**ی لەگەڵ خۆیدا برد.

**ڕۆنی** جیرانم بوو، یەکەم جیرانی هۆڵەندیم.

جیهانی من لە دوو بەش پێک دێ، جیهانێک لە نێو چیاکانی نیشتمانەکەمدا هەڵکەوتووە و ئەوی تریان لێرەیە، لە گوندێکی نزیک **ئەیسێل**. هەرگیز حەزم نەکردووە بەم جۆرە بێ، بەڵام بە دەست خۆم نەبووە. کەس بۆچوونی منی نەپرسیوە.

لە ماڵێکدا دەژیم کە سووچی گەڕەکێکی پێک هێناوە، لای ڕاست ماڵی دیکەی لێ نییە، **ڕۆنی** لای چەپم دەژیا. یەکەم جار کە بینیم لە تەنیشت باخچەکەی پشت ماڵەوە بوو، دواتر بەگشتی ئەم باخچەیە تەنیا شوێنێک بوو کە

چاوم پێی دەکەوت. سەرجەم ئەو بیرەوەرییانەی لەو هەمە بە جۆرێک لە جۆرەکان پەیوەندییان بە باخچەکەمانەوە هەیە.

ڕۆنیی بە دوا شەمەندەفەر ون بوو، بەڵام باخچەکەی هەر وا لە جێی خۆیەتی.

ئەمە ڕێک دەگەڕێتەوە بۆ کەی؟

بیرەوەرییەکی وردم سەبارەت بەم شتانە لە مێشکدا نییە، بەڵام دەوروبەری حەوت ساڵ لەمەوپێش بوو، مانگی مارس یان ئاوریل، کە یەکەم جارم چاوم بە ڕۆنیی کەوت.

وەک پەنابەرێک مافی ئەوەم پێی درا ماڵێکم هەبێ، کەسێکی سەر بە شارەوانی تا ماڵەکە ئێمەی ڕێنوێنی کرد. ڕێگەکە دەیتوانی ڕاستەوخۆ بمانگەیەنێ، بەڵام شۆفیرەکە پێچێکی لێ دا و بە درێژایی کەناری ئەیسێل ئۆتۆمبێلەکەی ئاژۆت؛ دەیویست ژینگەی دەوروبەری ماڵەکەی داهاتوومان پیشان بدا، پاشان بە نێو سەوزەڵانی و بە قەراغ مەزرا کۆنەکاندا ڕێگەیەکی باریکی گرتە بەر، ئینجا بە گەڕەکێکدا تێپەڕ بوو. دواجار کتوپڕ لە بەردەم ماڵێکی سەر سووچەکە ئۆتۆمبێلەکەی ڕاگرت.

جانتاکەم لە ژووره چۆڵەکەی ڕۆنیشتن دانا و بەرەو پەنجەرەکە هەنگاوم نا، لە پشت ماڵەکە کارێزێک هەبوو؛ من بەم جۆرە دیمەنانە ڕانەهاتبووم، ئێستا گشت ئەو شتانەی پیاوەکەی شارەوانی پیشانی دابووین لە بەر چاوم ڕاخراون: لەوەڕگە سەوزەکان، تراکتۆرەکان، لۆدە

گیـا کە هەنـدێکیان بە نـایلۆنێکی ڕەش داپۆشـراون، مانگاکـان کە خەریکـی لەوەڕن، کەنـاری **ئەیسـێل** کە دوورتـر دەخـزێتە پشـت درەختەکـانەوە و بـزر دەبـێ، هەروەها خەڵک کە پیاسە بە سەگەکانیان دەکەن.

پێشـتر کە لە پەنـجەرەوە سـەیری دەرێـم دەکرد چیاکـانم دەبینـی. حەزم دەکـرد بچـمە نێـو بـاخچەکەی پشـت مـاڵێ، بەڵام نەمدەزانی دەبێ کام کلیل بەکار بێنم. ئەو کەسەی هـاوڕێیەتی کردبـووین دەرگەی پشـتەوەی بـۆ کـردمەو، گژوگیای باخچەکە سەریان هەڵدابوو، تا ئەو ساتەوەختە قەت لە **هۆڵەندا** پێم نەنابووە نێو گیایەکی وەها زەبەندەوە.

ڕوانـیمە بـاخچەکەی **ڕۆنـێ**ی جیـرانم، یەکەم شـت کە سەرنجی ڕاکێشام دارهەڵووژەیەک بوو. درەختەکە هێشتا بەری نەگرتبـوو، دواتـر وەرزی هـاوین بینـیم لقەکـانی داهـاتوونەتەوە و هەڵـووژەی ڕەنگاوڕەنـگ، شـین، ڕەش و مۆریان پێوەیە، کە لە ژێر تیشکەکانی خۆردا دەبریقێنەوە.

دوو ڕۆژ دواتـر لە بـاخچەکە چـاوم بە **ڕۆنـێ** کەوت؛ پیاوێکی کەڵەگەت بوو، سەر و گەردنێک لە من بەرزتر، چلوحەوت سـاڵی تەمەن بـوو و قـژی سـپی ببـوو، مـن سیوسێ ساڵم تەمەن و قژم ڕەش بوو.

بە خۆشحاڵییەوە دەنگی بەرز کـردەوە: "هەلەو! کەوابێ تۆ جیرانە تازەکەمی؟"

لە بنکەی پێشـوازیی پەنـابەران هەوڵـم دابـوو هەنـدێک زمـانی هۆڵەنـدی فێر ببم، بەڵام هێشـتا نەمدەتوانی ئەو شتانەی فێریان ببووم بە کردەوە بیانهێنمە زمان.

درڕۆنگانە گوتم: "هەڵبەت، من جیرانتم."
دیـواری نێوانمـان نـزم بـوو، ڕووخـابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دابڕانێکی چێ کردبوو.
سـەرەتا پێم وا بـوو ڕۆنـێ تەنیا دەژی، لێ وا نەبـوو. ماوەمـاوە کچێکـی گەنـج لە پشـت پەنـجەرەکەوە بەدەر دەکەوت، کچێکـی گەنـج لە تەمەنـی پـانزە یـان شـانزە ساڵیدا.
دەمتوانی چەند ڕستەیەک بێنمە سەر یەک:
"ئەو کــچە گەنــجە کێــیە کە جارناجــارێ لە پشــت پەنجەرەکەوە بەدیار دەکەوێ؟"
"ئاخۆ کچتە؟"
"بۆچی لەگەڵ کچەکەت تەنیا دەژیت؟"
بەڵام هـیچ کـام لەم ڕسـتانەم بەکـار نەهێنـا، ژیانیـان پەیوەندیی بە منەوە نەبوو.
بەڵام مەراقـم ئاسـایی بـێ یـان نـا، پرسـیارەکان بـێ ویستی خۆم ختووکەی مێشکیان دەدام.
ڕۆنێ ژنی هەبوو؟
نەمدەزانی.
دەمتوانی لێی بپرسم: "ژنەکەت لە کوێیە؟"
نـا، جـوان نەبـوو. دیـارە بە شـێوەیەکی ئاسـایی ئەم پرســیارانە نــاکرێن، دواتــر هەمــوو شــتێک لە زاری دراوسێکانەوە دەبیستی یان بە تێڕامـان لە دەوروبەری خـۆت بـۆت ڕوون دەبێـتەوە. بەڵام تێگەیشـتنی مـن لە وشـەکان و پێکهـاتەی ڕسـتەکان لەوە سنووردارتر بـوو

ڕێگە بە خۆم بدەم بەم شێوازە وەڵامی پرسیارەکانم دەست بکەوێ.

ئێمە تازە هاتبووین، بێگانە بووین، هێشتا حیسابمان بۆ نەدەکرا. دەبوایە ماوەیەکی زۆر چاوەڕێ باین تاکو پەی بە نهێنییەکانی گەڕەکەکە ببەین.

ئێمە ئیتر لەو گەڕەکە دەژیاین، لەم گەڕەکەدا، لە دوو سێ مانگ لەمەوپێشەوە. دەرودراوسێ تەواو پشتگوێیان خستبووین، وەک ئەوەی هەر نەبین، وەک ئەوەی گەڕەکەکە بێگانەی لێ نەژی. ئەمنیش سەیرم نەدەکردن؛ لەبەر ئەمەش نەمدەزانی کێ لە کام ماڵدا دەژی یان کام ژن هاوسەری کام پیاوە.

بەڵام جیرانەکان چاودێریی ئێمەیان دەکرد، ژنانی گەڕەکەکەمان لە پشت پەردەکان خۆیان حەشار دەدا و ئەو شتانەیان کۆنترۆڵ دەکرد کە بۆ ماڵەوەمان دەکڕین:

"چەند پەردەیەک."

"مێزێکی نانخوارن. نا، مێزێکی نووسین."

"ئاوێنەیەک."

"کاتژمێرێکی دیوار. ئێوەش بینیتان؟ کاتژمێرێکی گەورەی دیواریان کڕی. نا من لە ئێوە دەپرسم! شتێکی ئاوها بە کەڵکی چییان دێ؟"

"چاکەتێک. بە دڵنیاییەوە لە کۆنەکە کڕیویانە."

"کۆمەڵێک کورسیی لەباوکەوتووی تایبەت بە باخچە."

کورسییەکم لە باخچەکە دانا و خووم دایە فێربوونی زمانی هۆڵەندی. هەوا گەرم بوو، هاوینێکی سووتێنەر بوو. لە وڵاتەکەی خۆم دەمتوانی لە ژێر تیرێژی خۆردا کار بکەم، بەڵام بە درێژایی یەکەم هاوینی هۆڵەندا نەکرا. نەمدەتوانی لە سەر شتێک چڕ ببمەوە، هاوینی ئێرە ئەزموونێکی تەواو جیاواز بوو بۆ من. پەلەوەرەکان، ئەو پەنجەرانەی لە پشتەوەیانڕا دەتتوانی هەموو شتێک ببینی؛ درەختەکان، گژوگیا، مێروولەکان، هاژەهاژ و ژنانی نیمچەڕووتی نێو باخچەکان هۆش و زەینی منیان لاڕێ دەکرد و لە بەردەم ڕاگرتنی ئەم وشە بیانییانە لە مێشکمدا دەبوونە ئاستەنگ.

**ڕۆنی** لە نێو باخچەکەی ڕاکشابوو، لە دیوارە شێواوەکەڕا بەشێک لە پشتە ڕەنگە مەیلەو شیرییەکەیم بینی؛ ئەو پیاوێکی چەرمگ و من ئەسمەر بووم.

خۆی وەرسووڕاند، لاسکە گیایەک بە نێوکییەوە نووسابوو. کەمێک خۆی بەرز کردەوە، لەناکاو کێرێکی زل بەدەر کەوت، چرچ و ژاکاو. هەرگیز کێرێکی وەهام نەبینیبوو، نە بە قەبارە و نە بە ڕەنگ. ئەوەی ڕاستی بێ، پێشتر هەرگیز کێری پیاوێکی ترم نەبینیبوو. نا، بە هەڵدا چووم. پێشتر جارێک بینیومە، تەنیا جارێک، ئەویش بە حاڵەحاڵ لە نێو تاریکیدا. کێری **ئەسفەرە کەچەڵ**، کە لە گوندەکەمان پاسکیلی نووژەن دەکردنەوە.

نەک بڵێی شتێکی بڤە بوو، نەخێر، تەنیا چونکە لە دەوروبەرم هەرگیز دەرفەت نەڕەخسابوو چاوم بە کێژێکی ڕووت بکەوێ. کە لەگەڵ باوکم دەچوومە حەمامی گشتی لانیکەم سەد تا سەدوپەنجا پیاوی لێ بوو، ئەوان لە سەر ئەرز دادەنیشتن و خۆیان دەشت، پەڕۆیەکیان لە نێو قەدیان دەهاڵاند. سەرباری ئەوەی کەسێکی ملوٶکار بووم، بەڵام نەمبینی کێژێک بە هەڵکەوت لە خاولییەکانەوە هاتبێتە دەر.

کاتێک دەچووینە حەمام باوکم هەمیشە هۆشداریی پێ دەدام: "ڕۆڵە گیان جوان دانیشە، وەک پیاوان دانیشە. گوێت لێمە؟ پێت دەڵێم جوان دانیشە!"

باوکم ئەمانەی ئەوەندە بە گوێدا چرپاندبووم، کە ئەگەر ئێستا کتوپڕ بمرم، دەستم بێ ئەوەی خۆم بمەوێ بەرەو نێوگەڵم دەخووشێ.

وردەوردە لەو گەڕەکەدا ڕووبەڕووی شتگەلی سەیرتر بوومەوە. دەبوایە پێیان ڕابێم، بە هەموویان ڕابێم. کارێزەکە دەیترساندم، ترسی ئەوەم هەبوو کوڕەکەم تیایدا بخنکێ. چواردەوری ماڵەکەی باوکم بەردی ڕەنگاوڕەنگی لێ بوو، ئەو زنار و بەردانە لە ژێر تیشکی خۆردا جۆرێک دەیاننواند و لە ژێر لێزمەی باراندا ڕەنگێکی تریان بە خۆوە دەگرت. دەبوایە بە ڕەنگی کەسک ڕابێم کە بە سەر هەموو شتێکی تردا زاڵ دەبوو. مانگایەک لە نێو مژدا بۆ من شتێکی نوێ بوو، هەروەها من لەگەڵ بارانی بەخوڕی **هۆڵەندا** ئاشنا

نەبووم. نەمدەویست بخووسێم، لە ماڵێ دەمامەوە تا ئەو کاتەی لێی دەکردەوە. گەلێک شتی تر هەبوون کە دەبوایە لەگەڵیان ڕابێم: قاچی ڕووت، زگ و سینە و سمتی ڕووت و هەروەها لەگەڵ ئەم زمانەدا. دیارە لەگەڵ ڕۆنیی جیرانیشم، بێگومان دەبوایە بێ شۆرت خووی پێ بگرم.

من بە ئینگلیزی قسەم دەکرد، بەڵام ئەو زمانەی کە دەبوایە فێری بم هۆڵەندی بوو. دەمویست ئەو کچە گەنجەی جارناجارێ بەیانیان دەهاتە باخچەکە، بە دەربڕینی چەند ڕستەیەکی بچووک بە هۆڵەندییەکی پەتی تووشی سەرسووڕمان بکەم؛ ئەویش ئەو کاتەی دەیویست هەڵووژەیەکی شینی تۆخ لێ بکاتەوە: "سلاو، من بولفەزلم. ئەتۆ ناوت چییە؟"

چەندین فەرهەنگم کڕین: فەرهەنگی هۆڵەندی - ئینگلیزی، فەرهەنگی ئینگلیزی - هۆڵەندی، فەرهەنگی هۆڵەندی - هۆڵەندی، فەرهەنگی هۆڵەندی - عەرەبی و فەرهەنگی عەرەبی - هۆڵەندی.

فەرهەنگی هۆڵەندی - فارسی و فارسی - هۆڵەندی نەبوو.

هەموو ڕۆژ و شەوێ لە سەر زمان کارم دەکرد. دەمتوانی بخوێنمەوە، بەڵام هێشتا بەو ئاستە نەگەیشتبووم بە ڕێکوپێکی بئاخڤم. زۆر لە خۆم دڵنیا نەبووم، لە قسەکردندا دڕدۆنگ بووم.

پاش تێپەڕبوونی شەش مانگ هێشتا پەیوەندییەکی ڕاستەقینەم لەگەڵ ڕۆنی نەبوو، تەنیا بە ڕێکەوت لە نێو باخچەکەدا چاوم پێی دەکەوت؛ دەنگی بەرز دەکردەوە: "سڵاو."

وەڵامم دەدایەوە: "هەلەو."

ماوەماوە هۆڵەندییەکان لە دەرگەیان دەدا، لەبەر ئەوەی ئێمە پەنابەر بووین کەرەستەی دەستی دوویان پێشکەش دەکردین.

- ئەم کەلوپەلانەتان گەرەکە؟

- نا، سوپاس.

- وەرزی هاوین تەواو بوو، چیتر پێویستیم پێیان نەماوە. گەلۆ ناتانەوێ؟ دڵنیاتان دەکەمەوە خاوێنن، پاکپاک شۆردوومن.

- نا، زۆر سوپاس.

- ئاخۆ دەتانەوێ ئەم جلانە تاقی بکەنەوە؟ تازەن بە ڕاستی.

- نەخێر، فرە سوپاس.

نازانم، ئایا هەوڵیان دەدا پەیوەندی دروست بکەن یان تەنیا دەیانویست لە ڕووی دڵسۆزییەوە شتێکمان پێ بدەن؟ بەڵام ئێمە بە چاوێکی تر سەیری ئەمەمان دەکرد، ئەم هەڵسوکەوتانەمان بە سووکایەتی دەبینی. ئێمە سەر بە کلتوورێکی تر بووین، کە بە هیچ شێوەیەک بابەتی کۆنە لە دەستی کەس وەرناگرێ.

ڕۆنی بانگی کردم:

- بولفەزل!
- چ بووە؟
بە خۆی و پاسکیلێکی کۆنی پیاوانەوە لە باخچەکە ڕاوەستابوو.
"تا ئێستا نەبوویتە خاوەنی پاسکیل، گوتم ڕەنگە ئەمەت پێویست بێ."
بەسەردا کەوتم و گوتم: "بەڵێ، زۆر سوپاس."
پاسکیلم پێویست بوو، چونکە بەم شێوەیە چیتر ناچار نەدەبووم خۆم لە ماڵێ بخزێنم. پاسکیلەکەم وەرگرت، چونکە هەستم دەکرد ڕۆنێ بە ئەنقەست ئەم پاسکیلەی بۆ من هەڵگرتووە.
لە سەردەمی گەنجیتی بەولاوە پاسکیلم لێ نەخوڕیبوو. ڕۆنێ دوو قاچی درێژی هەبوون، ئەمن نا. هەرچی بێ وەک قاچەکانی وی درێژ نەبوون، بەڵام گرنگییەکی ئەوتۆی نەبوو. بە پاسکیلی گەورە ڕاهاتبووم، جاران بە تەواوی پیاوەکانی ماڵەوە تەنیا پاسکیلێکمان هەبوو.
پاسکیلەکە بەردەوام لە دالانێ بوو، بۆ ئەوەی هەر کەسە و کاری پێی بوو لەگەڵ خۆیدا بیبا. بەتایبەت بۆ کاری بەپەلە، بردنی نەخۆشێک بۆ شار، بۆ کڕینی دەوا و دەرمان، ناردنی هەواڵ بۆ مامان.
ڕۆژێک پاسکیلەکەم هەڵگرت و خۆم گەیاندە بەردەم دوکانەکەی باوکم: "باوکە! خێرا وەرە! باوەگەورە خەبەری نابێتەوە!"

## ٢

ڕۆژەکان دەفڕین، شەوەکانیش. زەمەن لە **هۆڵەندا** بە شێوازی وڵاتەکەی من تێنەدەپەڕی. شەونشینییەکانی **هۆڵەندا** جیاواز بوون، کوڕەکەمان لە نهۆمی سەرەوە دەخەوت و منیش لەگەڵ ژنەکەم لە خوارەوە لە سەر قەنەفە دەخەوتین. جارجارە دەربارەی ڕابردوو قسەمان دەکرد، دەنا متەقمان لێوە نەدەهات. تەنیا چاوەڕێمان دەکرد. چاوەڕوانی چی؟ هیی کێ؟

چاوەڕوانی هیچ نەبووین، هەموو شەوەکان لێک دەچوون. بەڵام ڕۆژەکان بۆ ئێمە شتی نوێیان بە دواوە بوو.

کازیوەی بەیانییەکی زوو، لە باخچەکەی **ڕۆنی** تووشم بە تووشی پیاوێک هات. تووشبوون نا، چاوم پێی کەوت؛ پیاوێکی کورتەباڵام لە باخچەکە بینی. گوارەی لە گوێدا بوون، چاوەکانی و ڕوخساری خۆڵەمێشی بوون و وەک زۆپا جگەرەی دەکێشا.

گوتی: "سڵاو جیران!"

جیران؟ من و جیرانی ئەو؟ دیارە ڕاستی دەکرد، ئەویش جیرانی من بوو. گەڕەک هەموو دەیزانی من

نەبێ، نەمدەزانی دوو جیرانی دیوار بە دیوارم هەیە. ماوەی چەندین مانگ بوو هەموو کەس باسی جیرانی دووەممی دەکرد، وەلێ من هیچم لێ نەزانیبوو.
وەلامم دایەوە:
- سڵاو کاکە.
- من ناوم کاکە نییە.
وای گوت و ناوی خۆی پێ گوتم، بەلام یەکسەر ناوەکەیم لە بیر چووەوە. ناوی وا هەن مێشکم وەریان ناگرێ، هەڵبەت منیش زەحمەتی ئەوە بە خۆم نادەم ئەم ناوانە وەک خۆیان دەرببڕم. هەر کە چاوم پێی کەوت زانیم ناویم بۆ لەبەر ناکرێ. لە کاتی واد بۆ خۆم ناوێک لەو کەسانە دەنێم، ناوی ئەو کابرایەم نا **مۆکا مۆکا**.
ساڵێک بەس نەبوو، دەبوایە گەلێک وەرز و مانگ ددانم بە جەرگ داگرتبا تا دواجار پەی بە نهێنییەکانی گەڕەکەکە ببەم. بەلام پێش ئەوەی سەرجەم ئەم وەرزانە بێن و بچن، ڕۆژێک لە دەرگەیان دا. **ڕۆنی** لە پشت دەرگەکە بوو، قاتێکی شینی پۆشتەی پۆشیبوو و بۆینباخێکی سووری گرێ دابوو. قایشە زەردەکەی زەقزەق نیگای مرۆڤی ڕادەکێشا، شوێنەوارێک لە دەعبا گەورەکەی بەدی نەدەکرا.
"ساڵیادی لەدایکبوونم جەژن دەگێڕم، ئەمشەو دێن بمبینن؟"
زۆر باش شارەزای وشەی لە زاران قورسی "Gefeliciteerd" بووم، کە لێرە بۆ هەلومەرجی ئاوا

بەکـار دێ، بەڵام لەو ســاتەوەختەدا نەمـدەتوانی دەری ببڕم. وشـەیەکی دیکەشم نەدەناسی لە جیاتی ئەمەیان بەکاری بێنم، هەر بۆیەش دەستم ڕاداشت و تەنیا گوتم:

- زۆر سوپاس.

- مەبەستت چییە؟ دێن یان نایەن؟

چاوێکم لە ژنەکەم بڕی.

بە زمـانی خۆمـان گـوتم: "جیرانەکەمـان سـاڵیادی لەدایکبـوونی جەژن دەگێـڕێ، دەتەوێ ئەمشـەو سەرێکیان لێ بدەین؟"

کتوپڕ بە هۆڵەندی گوتی: "بەڕاست! سوپاسی چاکەتان دەکەیـن. بەڵـێ، دێـین. بـۆ ئـێمە مـایەی دڵخۆشـییەکی گەورەیە."

کە ڕۆنـێ ڕۆیشـت هێمنـانە دەرگەکەم داخسـتەوە، نەمتوانی پێش بە پێکەنینم بگرم؛ ڕۆنێ بەو دەعبا زلە سپییە شـیرییەی نێو پانتۆڵەکەیەوە، دەیویسـت فـوو لە مۆم بکا.

لە لای ئێمە کەس ساڵیادی لەدایکبوونی جەژن ناگێڕێ. مەرگ، بـۆ ئـێمە مەرگ لە هەمـوو شـتێ گرنگتـر بـوو. بـاپیرم لەمێـژ بـوو کـۆچی دوایـی کردبـوو، بەڵام شـەپقەکەی هەروا بە جلئـاوێزەکەوە هەڵواسـرابوو. جارناجـارێ لە سـەرم دەکـرد و لە ئـاوێنەوە سـەیری خۆمم دەکرد.

دایکم دەیگوت: "زۆر گەورەیە کوڕم، هێشتا بۆ سـەری تۆ زۆر گەورەیە."

ئێمە نەماندەزانی باپیرمان چ ڕۆژێک لەدایک بووە، کەچی ڕۆژی ناشتنەکەیمان لە بیر بوو. ئەوێ ڕۆژێ دایکم لە تەنیشت گڵکۆکەی هەڵووژەی بە دۆست و هاوڕێیان دا، ئێمە دەبوایە دوا هەڵووژە شینە تۆخەکانی دارەکەمانمان لێ نەکردباوە، دایکم ئەو هەڵووژانەی دەچنین و دەیخستنە قەرتاڵەیەکەوە. ڕێگەیان پێ دەدام قەرتاڵەکە تا سەر گۆڕەکە هەڵگرم.

دڕدۆنگانە بە چەپکەگوڵێکەوە ڕوومان کردە ماڵی **ڕۆنی**، من لە پەنجەرەڕا چاوێکم بە ژووریدا خشاند. کەسی لێ نەبوو، هیچ میوانێک بانگهێشت نەکرابوو، پزدان و گوڵ و گلۆپی زیادە بەدی نەدەکران. دەترسام ساڵیادی لەدایکبوونی نەبێ و من بە هەڵە تێگەیشتبم. لە دەرگەم دا، پیاوە کورتەبالاکە هات دەرگەی لێ کردینەوە.

- هەندێک دوودڵم، ئاخۆ ئەمشەو چاوەڕوانمان بوون یان من خراپ تێگەیشتووم؟

- فەرموون. بەخێر بێن.

پیاوە کورتەبالاکە گازی کرد: "**ڕۆنی**، وەرە. جیرانەکانت لێرەن."

هەناسەی، بۆنی نیکۆتین و بیرە و چەوری لێ دەهات.

**ڕۆنی** هات. سەرەتا ویستی خێزانم رامووسێ، بەلام دواتر پاشگەز بوویەوە.

ناشیانە گوتم: "Ge-fe-li-ci-teerd".

چاوم به دوای کچه گەنجەکەدا گێڕا، لەوێ نەبوو. بیرم کردەوە کە درەنگتر دێ، بەڵام نەهات. چاوەڕێ بووم هەندێک میوانی دیکەش ببینم، لێ کەس وە ژوور نەکەوت. ئێمە تەنیا میوانی ئەو ماڵە بووین. تەنانەت مۆمێکیش بەدی نەدەکرا، کەیکیش. ڕەنگە **ڕۆنی** شەوێکی دیکە ساڵیادی لەدایکبوونی جەژن گێڕابێ و بە ئەنقەست ئێمەی بە جیا بانگهێشت کردبێ.

گوتم:

- بەڕاستی ساڵیادی لەدایکبوونتە؟

- بێگومان. ئەمشەو چلوهەشتەمین ساڵی تەمەنم جەژن دەگێڕم.

قەرەوێڵەیەکی گەورەی دووکەسی لە بن پەنجەرەکە یەکسەر سەرنجمی ڕاکێشا. لە ڕاستیدا دەمزانی بۆچی قەرەوێڵەکە لەوێ دانراوە، لە لایەکیشەوە دڵنیا نەبووم. چونکە پێم سەیر بوو لە ماڵێکدا کە کچێکی گەنج بژی، قەرەوێڵەیەک هەبێ کە وێدەچوو هیی پیاوان بێ. لەوە دەگەیشتم دوو پیاو لە ئامێزی یەکتر دابن، جەستەیان کەیلی ئارەق، بەڵام نەمدەتوانی لەوە بگەم لە هەمان کاتدا کچە گەنجەکە بتوانێ لە نێو قەرەوێڵەکەی لە نهۆمی سەرەوە بە ئاسوودەیی بخەوێ.

تەنیا کاتێک دایکمان سەردانی کردین، بە تەواوی ئاگەداری ئەم شتە بووم.

بە هۆی ئەوەی **ڕۆنی** لەگەڵ ئەم پیاوە کورتەباڵایەدا دەژیا، لە خۆمم دەپرسی ئاخۆ دەتوانم شوێنەوارێک لە

ژنەکەی بدۆزمەوە؟ چوومە هۆڵەکەوە و بەسەر چەند وێنەیەکی سەیروسەمەرەدا کەوتم، کە بە دیوارەوە هەڵواسرابوون. کۆمەڵێک وێنەی ڕووتی پیاوان، وێنەی سمتی پیاوان، سمتگەلی ڕووت، سمتی ڕەنگ بزرکاو و تووکن. سەیری خێزانەکەمم کرد، "تۆ بڵێی کەوتبینە ناو تەڵەیەکەوە؟" دەمتوانی ئەم ڕستەیە لە چاوەکانیدا بخوێنمەوە. نا، من هەستێکی وەهام نەبوو. ئێمە لەناکاو لە کلتوورێکەوە کە تیایدا هەموو شتەکان لەودیو پەردەکانەوە ڕوویان دەدا، کەوتبووینە نێو کۆمەڵگەیەکی نیمچەڕووتەوە. بە خۆمم گوت ئێستا وا باشە بێدەنگ بم، سەیر بکەم و بە سەرنجەوە گوێ لە دەوروبەرم بگرم.

**مۆکا مۆکا** ڕووی کردە خێزانم، منیش لە نێو ژوورەکەدا چووم و هاتم. وێنەیەکی تریش هەبوو، وێنەیەکی ئۆرژینال، وێنەی مەمکەکانی ژنێک لە نێو ئاوێنەدا. مەمکەکانی ژن؟ ئاخۆ پێگەیشتبوون؟ نا، بەو شێوەیە نا. وێنەکە تەواو سەرنجی ڕاکێشام.

"ئەم مەمکانەی نێو ئاوێنەکە مەمکی کچەکەتن؟"

ڕستەیەکی کورتی بەم شێوەیە بە فارسی، هەرگیز ختووکەی مێشکم نادا. بە هۆڵەندیش قەت نەمدەتوانی دەری ببڕم، بەڵام دەمتوانی بیهێنمە سەر کاغەز، بەڵێ، ئەمەیانم دەتوانی.

## ٣

تەنیا کار و چالاکیی **ڕۆنیّ** وێنەگرتن بوو، جارناجاریّ وێنەیەکی ڕەش و سپی. ئەو وێلی بیرۆکەی نویّ بوو، بیرۆکەی نویّ و بابەتی نویّ. بەڵام لە دەوروبەری من شتێکی نویّ بەدی ناکریّ.

بۆ ماوەیەکی دووردودرێژ هیچ وێنەیەکی نەگرتبوو، تا ئەو ساتەی دایکم هاتە سەردانمان.

ئەوکات ئێمە ساڵ و نیوێک بوو لەو ماڵەدا دەژیاین.

ئەو وێنەیەکی گەورەی ڕەش و سپیی لە دایکم گرت.

پاشنیوەڕۆیەک **ڕۆنیّ** لە باخچەکەدا بانگی کردم:

- **بولفەزل!**

- چ بووە؟

- شتێکم بۆ دایکت پێیە.

- بۆ دایکم؟

وێنەیەکی گەورەی ڕەش و سپیی بۆ خستمە نێو چوارچێوەیەکەوە.

لە وێنەکەدا دایکم دەبینرا کە بە سەر دیوارەکەدا دەستی ڕاداشتووە، دەستێکی گەنج و ژنانەش هەڵووژەیەک دەخاتە نێو دەستەکانییەوە.

دوا هەڵووژە، دەستە چرچەکانی دایکم و دەستە تورت و تازەکانی کچە گەنجەکە پێکەوە وێنەیەکیان پێک دێنا، کە تیایدا هەڵووژەیەک وەک دڵۆپێک فرمێسک دەکەوتە نێو لەپی دەستی دایکمەوە.

دایکم لە وێنەکەی ڕوانی.

"ئەم وێنەیەت لە کوێوە بۆ هاتووە ڕۆڵە؟"

گوتم: "کاری **ڕۆنی**یە، **ڕۆنی** ئەم وێنەیەی گرتووە."

سەری وەرسووڕاند، حەزی بە چارەی ئەم وێنەیە نەبوو. نەیدەویست شتێک لە لای **ڕۆنی**وە بێ، هیچ شتێک.

**ڕۆنی** گومڕا بوو.

دایکم گوتی: "ژیان لە نزیک **ڕۆنی** سزایەکە."

لێم پرسی: "چۆن؟ سزای چی؟ بۆچی دەبێ سزا بێ؟"

دایکم شیکردنەوەی نەدا و حەزی نەدەکرد لەم بارەوە هیچ ببیسێ.

دایکم بڕوامەند بوو، پرەنسیپی تایبەت بە خۆی هەبوون و بە چاوێکی تەواو جیاواز لە گۆڕانکارییەکانی ژیانی منی دەڕوانی. ئەو بیرۆکەیەی کە سزایەک لە گۆڕێیە، تەواو جیاواز بوو لەو سزایەی لە کلتووردا پێناسەی بۆ کراوە.

نا، **ڕۆنی** بە هیچ شێوەیەک سزا نەبوو. بە پێچەوانەوە، ئەو پاڵپشت و داشداری من بوو؛ هەر کات پرسیارێکم هەبوایە دەمتوانی ئاڕاستەی بکەم.

چونکه دایکم نەیدەویست ئیتر لەم بارەوە هیچ ببیسێ، پێداگریی زیاترم بۆ خۆم هێشتەوە. دایکم ژینگە ئاشناکەی جێ هێشتبوو تاکو لە **هۆڵەندا** چاوی بە من بکەوێت، گشت ئەو شتانەی دەیبینین لەگەڵ باوەڕی وی ناکۆک و مایەی لۆمە بوون.

جارێک کە لە نوێژی شەوانەی ببووەوە، بیستم دەڵێ: "خوایە، کوڕەکەم بپارێزە، لە دایکە پیرەکەی خۆش بە."

دەمزانی تەنانەت ناتوانێ ئەو شتانە وێنا بکا کە لە ماڵی **ڕۆنی**دا ڕوو دەدەن. دڵنیا بووم هەرگیز پەی بەمانە نابا، بەڵام بە هەڵەدا چووبووم.

وێنەکەم لە پشت دۆلاب شاردبووەوە. پاش ڕۆیشتنی دایکم وێنەکەم بە ژووری میوانانەوە هەڵواسی؛ دایکم بە چارشێوەکەی و دەستە درێژکراوەکانی بۆ ئەوەی هەڵووژەیەکی پێ بدرێ.

ئەژنۆیەکی دایکم ئازاری هەبوو و نەیدەتوانی هەموو جارێ بە سەر پلیکانەکاندا هاتوچۆ بکا.

ڕێک وەک **ڕۆنی** قەرەوێڵەیەکم لە بن پەنجەرەی ژووری ڕۆنیشتن دانا، بەم جۆرە ڕاحەت دەیتوانی هەستێ و نوێژی بەربانگ بەجێ بێنێ.

ئێوارە داهاتبوو، خۆم خزاندبووە ژووری کارکردنم کە لە نهۆمی یەکەم هەڵکەوتبوو. کتوپڕ دایکم لە باخچەکەوە بە پرتاو هات و سەرباری ژانی ئەژنۆکانی، یەکسەر خۆی گەیاندە من.

"چ بووە دایە؟"

بە پەلە ڕووی کردە حەمامەکە.

قۆڵی کراسەکەی هەڵدا و پرسی: "ئاو! کوا ئاو؟"

ئاوە گەرمەکەم بۆ بەردایەوە.

بە پەلەپەل دەست و پێ و ڕوخساری شۆرد و دەستنوێژی هەڵگرت. خۆی لە چارشێوەکەی وەرپێچا و ڕووی کردە قیبلە.

لە باخچەکەوە دەتتوانی قەرەوێڵەکەی ڕۆنی لە کاتی خۆرئاوا بووندا ببینی. کە خۆر دوایین تیشکەکانی دەناردە ژوورەکەی ڕۆنیەوە، قەرەوێڵەکە لە نێو چوارچێوەی پەنجەرەکەدا بەدەر دەکەوت. من بەردەوام دەمبینی، بەڵام قەت کەسی لە سەر نەبوو. ڕێکەوت بە شێوەیەکی تر بۆ دایکم بڕیار دەدا؛ ئەو قەرەوێڵەیەک و دوو پیاوی ڕووتی وەک شووشەی بینیبوو، پیاوێکی کەڵەگەت و پیاوێکی کورتەبالا. سەرەتا بڕوای بە چاوەکانی نەکردبوو، هەمدیس بەوپەڕی وردبینییەوە لە پەنجەرەکەی ڕوانیبوو. نەخێر، ئەمە بەرهەمی خەیاڵی وی نەبوو. جیرانەکان بوون، ڕووتوقووت بوون.

دەمتوانی چی پێ بڵێم؟ چۆنی بۆ شی بکەمەوە؟

"لە سەر قەرەوێلەکە ڕاکشابوون دایە؟"

"لە سەر قەرەوێڵەکە ڕاوەستابوون؟"

"کارێکی بڤەیان ئەنجام دەدا؟"

لە لای ئێمە جوان نەبوو پرسیاری لەم شێوەیە بپرسی، گفتوگۆیەکی هاوشێوە لە نێوان ئێمەماناندا مەحاڵ بوو.

دەبـــوایە لەگەڵ خـــودای خۆیـــدا وازی لـــێ بێـــنم، لە ژینگەکەی بێمە دەرێ.

نزیکەی نیوکاتژمێرێـک نـوێژی کـرد، کە لـێ بـووەوە لە بەر خۆیەوە گوتی: "مەرگ، مەرگ. تووتیی مەرگ."
باســی تــووتییەک و مەرگــی دەکــرد، بەڵام نەمــدەزانی دەیەوێ بڵێ چی.
- باسی چ دەکەی دایە؟
- هیچ کوڕم.
وای گـوت و بە ســووچی چارشـێوەکەی ئەســرینەکانی سڕینەوە.
به درێژایی شـەو تـووتییەک لە خەوما لە شـەقەی باڵی دەدا، تــووتییەکی ســەر بە چیرۆکێکــی کـۆنی فارســی. تــووتییەکە چەنــدین ســـاڵ لە قەفەزدا ژیــا، شـــەوێک چاوەکانی نووقاند و قورس و گران بە لادا هات.
خـاوەنە پیـرەکەی کـڕووزایەوە: "مخـابن، تـووتییەکەم مرد."
تــووتییەکەی لە قەفەز دەرهێنـــا و فڕێـــی دا. لەناکـــاو تووتییەکە ژیایەوە و خۆی ڕزگار کرد.
پیرەمێرد بە سەرسـووڕمانەوە لە تـووتییەکەی پرسـی:
- باشە ئێستا وا بە پەلە بۆ کوێ دەچی؟
- مـــاڵی خۆمـــان. مـــاڵی خۆمـــان. مـــاڵی خۆمـــان.
تــــووتییەکە بە دەنگێکـــی بەرز وای گـــوت و لە بەر چاوان ون بوو.

دایکم چیتر نەیدەویست لە سەر قەرەویڵەکەی بخەوێ.
- ئەمەی لێرە لابە کوڕم، لە سەر ئەرزەکە دەخەوم.
- ئەرزی ئێرە سارد و شێدارە دایە، قاچەکانت ئێشیان پێ دەگا.
نەیدەویست هیچ بزانێ. تەنانەت نەیدەویست چیتر لە بن پەنجەرەکە بخەوێ. قەرەوێڵەکەم لا برد و دۆشەکێکم لەوێ ڕاخست.
کە ڕۆنی بەدەر دەکەوت، دایکم بزر دەبوو. حەزی بە چارەی ڕۆنی نەبوو، بەڵام کچەکەی خۆش دەویست. پێم وایە دڵی پێی سووتابوو، چونکە هەستی دەکرد کچە لە ژووری باوکیدا بەند کراوە. دایکم خۆی چوار کەنیشکی هەبوون، نۆبەرەکەی چەندین ساڵ لە گرتووخانە بوو. دەیزانی مانەوەی کچێکی گەنج بە تەنیایی لە سلوولێکدا چ واتایەک دەگەیەنێ.
- ئەم کچە گەنجە ناوی چییە؟
- تەواو دڵنیا نیم، بەڵام پێم وابێ ناوی مارینا یان میراندا یان... ناوێکە م و تی تێدایە.
- ڕەنگە میترا بێ.
- نا نا، میترا ناوێکی فارسییە.
- ئەی دایکی لە کوێیە؟
- نازانم.
- کچێکی ئاوا گەنج چۆن دەتوانێ لە ماڵێکی وەهادا درێژە بە ژیان بدا؟
- چووزانم دایە.

دایکم بۆی پاڕایەوە. بۆ ئەو و بۆ منیش.
دایکم ڕۆنیی خۆش نەدەویست، بەڵام ڕۆنی ڕێزی لە دایکم دەگرت. باش تێدەگەیشت کە ئەم سەفەرە بۆ دایکم تایبەتە، پێم گوتبوو لە وڵاتەکەی خۆمان هەرگیز بۆم نەلواوە شتێکی باش بۆ دایکم بکەم و ئارەزوومە بە کۆڵێک بیرەوەریی خۆشەوە بگەڕێتەوە وڵاتەکەی. باسی ئەوەم بۆ کردبوو کە دایکم بڕوامەندە و وا بە سانایی ملی بەم سەفەرە نەداوە، ئەویش بەردەوام دەیگوت ئەگەر لە ماوەی سەفەرەکەیدا پێویستیم بە شتێک بوو، مشکڵۆزمەی دەبم گەر پێی نەڵێم.
هەفتەیەک بەر لەوەی دایکم بێ، لە سەر چیمەنی باخچەکەی پشت ماڵەوە چاوم بە قەرەوێڵەیەکی یەک کەسی کەوت، ڕۆنی لەوێی دانابوو.
"ئەمە بۆ دایکتە. ئەگەر هات پێویستی بە قەرەوێڵەیەک دەبێ."
ڕاستی دەکرد، من هێشتا بیرم بۆ ئەمە نەچووبوو.
شەوێکی پاییز، کە هەوا ساردی کردبوو و دایکم هێشتا لە لام بوو، کەسێک لە دەرگەی دا. بەگشتی شەوانە قەت کەس لە دەرگەی نەدەدا.
– کێیە؟
– منم.
ڕۆنی بوو، چەند بەتانییەکی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو.
"ئەمشەو زۆر سارد دەبێ، چەند بەتانییەکی زیادەم بۆ دایکت هێناوە."

خێرا بەتانییەکانم لە ژێر قەنەفەکە حەشـار دا. دایکم لە سەرەوە بوو، نەدەبوایە پێ بزانێ، ئەگینا یەکسەر بـار و بنەی دەپێچـایەوە و دەیگـوت: "لەگەڵـم وەرە بـا بـڕۆین، چیتر نامەوێ لە بنمیچی ماڵەکەتدا بمێنمەوە."

## ٤

سەرەتا ڕۆنی تەنیا جیرانێک بوو، جیرانێک و بەس. پاشان بۆ من بوو بە فەرهەنگێکی زیندوو. یەکەمین پەیوەندییەکانم لەگەڵ ئەو لە سەر ئەو وشە و ڕستانە ساغ ببووەوە کە تێیان نەدەگەیشتم، کەچی بە تێپەڕبوونی زەمەن نێوەڕۆکی باسوخواسەکانمان گۆڕانی بەسەردا هات. ئێستا ئیتر دەمتوانی گیروگرفتەکانی خۆم چارەسەر بکەم، بەڵام سەرباری ئەوەش داوای یارمەتیم لێ دەکرد.

بۆچی؟ چما هەوڵم دەدا پەیوەندیی نێوانمان ڕابگرم؟ ڕەنگە لەبەر ئەوەی سەر بە کلتوورێکی تر و کۆمەڵگەیەک بووم، کە خەڵکەکانی یارمەتیی یەکتر دەدەن، یان ڕەنگە لەبەر ئەوەی ڕۆنی وای دەخواست. ئەو لە چنگ تەنیایی ئازاری دەچێشت، من هەستم دەکرد پشتگوێ خراوم؛ بۆیە هەر کام لە ئێمە بەدووی هاوڕێیەتیی ئەویتردا دەگەڕا. بەڵام تەنیا ئەو کاتە کە دایکم هات، لاپەڕەیەکی نوێ هەڵدرایەوە.

– ڕۆنی، لەوێی؟

– فەرموو.

- گوتم لەوانەیە بزانی قیبلە لە کام لایە.
- مەبەستت چییە؟
- پرسیم ئاخۆ دەزانی **مەککە** لە کوێ هەڵکەوتووە.
- **مەککە**؟
- سەیر کە، دایکم دەیەوێ ڕوو بکاتە **مەککە**، بەڵام باش نازانم لە کام ئاڕاستەدایە.

گرفتاری پەتایەکی نوێ ببووم، بەڵام هەستم پێ نەکردبوو؛ بە تەواوی ئاڕاستەی شوێنەکانم لێ تێک چووبوو. کە دایکم بووە میوانمان، ئەودەم بۆم دەرکەوت ناتوانم ئاڕاستەکان لێک بکەمەوە. لە ماڵی بابم بە چاونووقاندنەوە دەمتوانی بزانم **مەککە** لە کوێ هەڵکەوتووە، خۆر لە کوێ دەردەکەوێ و لە کام لا ئاوا دەبێ. بەڵام لە **هۆڵەندا** دەبێ لە نێو هەورەکانەوە بە دوای خۆردا وێڵ بم.

دایکم کێشەیەکی دیکەشی هەبوو، ئەو چەمکی کاتی لێ تێک چووبوو. بە هۆی ئەوەی خۆر ماوەیەکی زۆر لە ئاسمان دەمایەوە، نەیدەزانی کەی دەبێ نوێژی شەو دابەستێ.

دەیپرسی: "ئەرێ ئێستا شەوە یان هێشتا ڕۆژە؟"

دەمگوت: "کارت بە ئاسمانەوە نەبێ، زیاتر سەیری ئەم کاتژمێرە بکە."

مەبەستم ئەو کاتژمێرە گەورەیە بوو، کە لە بازاڕی کۆنەکە کڕیبووم و ڕۆژەکان، کاتژمێرەکان و خولەکەکانی ژیانی **هۆڵەندامی** دەژمارد.

**تــازە لە فڕۆکەخــانەی ســخیپوولی ئامســتردام** گەڕابووینەوە، دایکم لە بەر دەرگە پێلاوەکانی دانان و وە ژوور کەوت. هێشتا جانتاکەیم بە دەستەوە بوو، دایکم چووە نێوەڕاستی ژوورەکە ڕاوەستا. سەرەتا سەیری لای چەپ و ئینجا لای ڕاستی کرد، بیرم بۆ ئەوە چوو کە دەیەوێ بزانێ کورەکەی کە لە چنگ پۆلیس ڕای کردووە، لە ماوەی ئەم چەند ساڵەدا چۆن توانیویەتی سەرلەنوێ خۆی سەقامگیر بکاتەوە.

مەراقم دەکرد بزانم چ کاردانەوەیەک پیشان دەدا.

- **بولفەزل!**
- بەڵێ دایە.
- قیبلە لە کام لایە؟

وەک ئەوە وا بوو زللەیەکم لێ بدرێ، هەستم کرد کەوتوومەتە تەڵەوە. جانتاکەم لە سووچێک دانا و بە دەم سەیرکردنی هەورەکانەوە هەوڵم دا بزانم قیبلە لە کام لا هەڵکەوتووە، لە پەنجەرەی ئەوسەری ژوورەکەڕا لە دەرەوەم دەڕوانی. هێشتا ڕۆژ بوو، بەڵام شتێکی تایبەت بۆ بینین بەدی نەدەکرا. مانگاکان پاش تێپەڕاندنی ڕۆژێکی درێژ و لەوەڕین لە لەوەڕگەکان شەکەت ببوون، کارێزەکە لە بێدەنگیدا چاوەنواڕی شەو بوو و بەنداوەکە بە نێو دارەکان و درێژایی رووباردا نم و شێدار لە بەر چاو ڕاخرابوو. لەناکاو زەنگی کڵێسەیەکم بینی لە سەرووی بەنداوەکە قووت ببووەوە.

- ئەوێ دەبینن دایە؟ منارەی کڵێسەکە؟
- کڵێسە؟ هیچ کڵێسەیەک نابینم.
- سەرەتا دەبێ سەیری بەنداوەکە بکەی، سەیری ئەم بەنداوە درێژە بکە کە لە نێو دارەکاندا بزر دەبێ، دەیبینی؟ دەبێ ڕووت لە ئاڕاستەی ئەم منارەیە بێ.

زەنگی کڵێسەکە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێ کاری خۆی جێبەجێ کرد. لە ژووری کارکردنەکەم لە نهۆمی سەرەوە، ئەو شوێنەی وا دایکم ڕۆژانە نوێژەکانی دادەبەست، دەتتوانی بە ئاسانی ببینی. بەڵام جارێک دایکم لەناکاو تکای لێ کردم بچمە لای.

- **بولفەزل؟**
- چ بووە دایە؟
- کڵێسەکە ون بووە.
- چۆن؟
- منارەی کڵێسەکە ون بووە.

بە غاردان سەرکەوتم. ڕاستی دەکرد، منارەکە لە نێو تەمومژدا ون ببوو.

**ڕۆنی**! دەبوایە لە تەک **ڕۆنی**دا ڕاوێژ بکەم، پێکەوە دەمانتوانی ڕێگەچارەیەک بۆ کێشەکەی دایکم بدۆزینەوە.

**ڕۆنی** لە ژووری ڕۆنیشتنی خۆیاندا نەخشەیەکی کۆنی لێک کردەوە، من سەرەتا بە دوای ناوی **عەرەبستانی سعودی** و ئینجا **مەککە**دا گەڕام.

هەندێک شتم یادداشت کرد، **ڕۆنی** ڕۆیشتە گەنجینە و قیبلەنمایەکی کۆنی هێنا. کەمێک دواتر چووینە ماڵەکەی من و بۆ نهۆمی یەکەم سەرکەوتین، **ڕۆنی** کە هەر وا قیبلەنماکەی بە دەستەوە بوو، پەنجەرەکەی کردەوە و لە منارەی کڵێسەکەی ڕوانی. پاشان پەنجەرەکەی پێوە داوە و دیسان لە قیبلەنماکە ورد بووەوە.

"ئاوایە **بولفەزل**، دەبێ ڕوو بکەیتە ئەوێ."

بە یارمەتیی نەخشە و قیبلەنماکەی، بەشێکی زۆر لە بەهرەی ناسینەوەی ئاڕاستەکانم بەدەست هێنایەوە. ئێستا هیچ نەبوایە دەمتوانی بزانم خۆر لە کام لا دێتە دەر، تەنانەت ئەگەر بە درێژایی هەفتەیەک باران باریبا، هەروەها دیسان دەمزانی خۆر لە کام لا ئاوا دەبێ، ئەگەرچی کەل و چیا نەدەبینران.

دەمویست بانگی دایکم بکەم بۆ ئەوەی پێی بڵێم قیبلە لە کام لایە، بەلام **ڕۆنی** گوتی: "ڕاوەستە! من بیرۆکەیەکی باشترم هەیە."

بەرەو ژوورەکەی ژێربان ڕۆیشتین، ژوورە ژێربانە تەنگ و تاریکەکەی **ڕۆنی**.

گوتی: "پڕە لە وردەواڵەی کۆن."

من هیچم نەدەبینی. گەرچی دەمبینی، سێبەری کۆمەڵێک شت لە نێو ڕووناکاییەکی زەرد و نەزۆک. هاتە سەر چۆک و بە دوای شتێکدا گەڕا. هەوڵی دەدا بۆم شی بکاتەوە ئەو شتە چییە بە دوویدا وێڵە، بەلام

من نەمدەزانی چیم پێ دەڵێ، ئەوەندە نەبێ کە بە دوای مەلێکدا دەگەڕێ.

مەلی چی؟

دەیویست بڵێ کەڵەبابێک، کەڵەبابێک کە لە سایەیەوە بۆ هەتاهەتایە ئاڕاستەی شوێنەکان بدۆزمەوە.

هەڵترووشکابووم و چاوەڕێ بووم کەڵەبابەکە دەربکەوێت.

لە قوژبنێکی تاریکەوە ڕۆنی دەنگی بەرز بووەوە: "خۆیەتی، هەمە."

لە نێو ڕووناکییەکەدا بینیم شتێکی ئاسنینی بە دەستەوە بوو.

هاتینە خوارەوە. لەوێ لەتە ئاسنەکەی کە بە سەری دارێکەوە لکابوو، لە سەر مێزێک دانا.

- ئەمە چییە؟

- کەڵەبابە.

- کەڵەباب؟

بە پەڕۆیەک تەپوتۆزی لەتەئاسنەکەی سڕییەوە، سەرەکەی گرت و بە شێوەیەکی ڕاستەوەبوو لە سەر مێزەکەی دانا.

گوتی: "دەبێ ئاوا دابنرێ."

قیبلەنما بوو، قیبلەنمای سەر منارەی کڵێسەیەک کە لە کەڵەباببوون کەوتبوو و ببووە مەلێکی کۆن و ژەنگاوی.

کەڵبابەکە لە بنەوە ژەنگی گرتبوو و چیتر نەیدەتوانی بە ئاڕاستەی بادا بسووڕێ، ڕۆنیش کتومت هەمان سەرنجی لا دروست ببوو.

"نەگۆڕە، چیتر ناتوانێ بجووڵێتەوە."

لە دڵی خۆمدا گوتم ئەمە مەحاڵە، کەڵەبابێک دەبێ بجووڵێتەوە، هیچ کەڵەبابێک ناتوانێ مەنگ بێ. ئەم کەڵەبابە هێندە لەو ژوورەی ژێربان، لە نێو تاریکی و نیوەڕاستی کەلوپەلەکاندا مابووەوە کە ببووە کەڵەبابێکی مردوو. بەڵام ئێستا کە ڕۆنێ هێنابوویە ژێر ڕووناکی، بە ڕای من دەبوایە بجووڵێتەوە.

لە خەیاڵ و بیرکردنەوەکانی مندا کەڵەبابەکان پڕ جموجوڵ بوون. کەڵەبابەکانی سەردەمی منداڵیی من قەڵەو و پتەو بوون، کەڵەبابی شەڕ بوون و دەیانتوانی لە شوێنی خۆیان دەرپەڕن، ئەو کەڵەبابانەی بە دەنووک و پارچە پۆلاکانی لەشیانەوە داشداری پێداویستییەکانی بنەماڵەیەک بن.

وەک جیرانەکەمان کە لە سایەی کەڵەبابەکەیەوە شەش منالەکەی دەژیاند. کەڵەبابەکەی ئێمە بەر لە دەرکەوتنی خۆر خۆی دەهاویشتە سەر دیوار و باوکمی خەبەر دێنا بۆ ئەوەی نوێژی بەیانی دابەستێ. بەڵێ، کەڵەبابی گەوجی نێو ژوورێکی ژێربان بۆ من نامۆ بوو، کەڵەبابێک دەبوایە ئەرکی خۆی پێک بێنێ، وەک کەڵەبابەکەی حەسەن وەیلان.

**حەسەن وەیلان** پیاوێکی بەساڵاچوو بوو، قەڵەندەرێک بە کەڵەبابێکەوە. کەڵەبابێکی گەورە و دندووک پۆڵایینی هەبوو، حەسەن سەرووی هەشتا ساڵی تەمەن بوو و لەودیوی چیاکانەوە هاتبوو. ڕۆژێکی ساو و خۆش، پیرەمێردێک لە مەیدانی گوند بەدەر کەوت.

"لە کوێوە دێی کاک **حەسەن**؟"

نەیدەزانی، بەڵام کەڵەبابەکەی دەیزانی. کەڵەبابەکە ڕێنما بوو، ئەو بوو ئاراستەی ڕۆیشتنی دیاری دەکرد.

وێڵ، **حەسەن** وێڵ و سەرگەردانێکی هەمیشەیی بوو.

کاتێک کڵاوە ڕەش و کۆنەکەی لە سەری کەڵەبابەکەی دادەنا، کەڵەبابەکە وەک بزنێک لە لای دەمایەوە. کە کەڵەبابەکە بە کڵاوەکە دادەپۆشرا لە جێی خۆی نەدەجووڵایەوە، دەتگوت کەڵەبابێکی مردووە. بەڵام **حەسەن** هەر کە کڵاوەکەی لا دەبرد کەڵەبابەکە دەستبەجێ دەبووژایەوە؛ جا کوڕی هەرە بوێریش خۆیان لێ دوورەپەرێز دەگرت.

پاشنیوەڕۆیەک کە هەوا زۆر گەرم بوو، کەڵەبابەکە وەک هەمیشە، سەر لە بن کڵاو لە ژێر سێبەردا خەوتبوو. **ئەسغەرە کەچەڵ**، وەستای پاسکیلەکانی گوند، بەوێندەردا تێپەڕیبوو و یەک بە خۆی هۆڕنی لێ دابوو، کەڵەبابەکە سەری لە بن کڵاوەکەوە هێنابووە دەرێ. هەر کە **ئەسغەرە کەچەڵ**ی لە سەر پاسکیلەکە بینبوو، بازی دابووە سەر شانی. کەڵەبابەکە بەو

دندووکە پۆلایینەی سێ دندووکی لە سەرە تاسەکەی **ئەسغەر** دابوو.
**ئەسغەر** چەقۆیەکی لە گیرفانی پانتۆڵەکەی دەرهێنابوو.
"باش گوێ بگرە **حەسەن**! کەڵەبابەکەت سەر دەبڕم، جا ڕۆژەکانی تر دەبێ لەم دەوروبەرە سەرگەردان بی."
**حەسەن** بە کەڵەبابەکەی گوتبوو: "وەرە! ڕێگەم پیشان بدە، دەبێ بڕۆین."
کەڵەشێرەکە سەیری چەپ و ئینجا ڕاستی کردبوو، پاشان لای چەپی هەڵبژاردبوو. **حەسەن** دەستی دابووە گۆچانەکەی، کڵاوەکەی کردبووە سەر و خۆی بە کەڵەبابەکەی سپاردبوو.
**ڕۆنی** پەیژەکەی بە دیواری گەنجینەکەوە نا و داوای لێ کردم توند بیگرم. بە کەڵەبابە ئاسنینەکەی دەستییەوە بە پەیژەکەدا سەرکەوت، بە پارێزەوە تا سەربان هەڵکشا.
هاواری کرد: "قیبلەنماکە!"
قیبلەنماکەم بە هێمنی پێ دا. هەوڵی دا ئاراستەکە بدۆزێتەوە، چەند جار سەری کەڵەبابەکەی بەرەو لای باشوور و پاشان باشووری ڕۆژهەڵات و ئینجا ڕۆژئاوا وەرسووڕاند.
هاواری کرد: "ئەو بەنە!"
بەنەکەم پێ دا و کەڵەبابەکەی بە دوو کەڵکێشە کۆنەکەوە گرێ دا.
گوتی: "تەواوە."

کەمێک دواتر بە دوای دایکمدا ڕۆیشتم.

- فەرموو دایە، ئەوەش بۆ ئەوەی بزانن ڕووەو کوێ نوێژ دابەستن؛ ڕێک بە ئاراستەی ئەم کەڵەبابەدا.

- کام کەڵەباب؟

- کەڵەبابەکەی ڕۆنی، ئەوەتا، لە سەر گەنجینەکەیە. ئەگەر ڕوو بکەنە ئەو شوێنەی کەڵەبابەکە ڕووی تێ کردووە، ئەوا قیبلە ڕێک دەکەوێتە بەرامبەرت.

ڕۆنی سەیری کردین، لە دایکم و چارشێوەکەی ڕوانی. "ڕۆنی ئەم کارەی بۆ ئێوە کردووە دایە."

دایکم بە ڕۆنیی گوت:

- سوپاس، نزات بۆ دەکەم.

- دایکت گوتی چی؟

- گوتی تاوێکی تر بۆتان دەپاڕێتەوە.

شەو دایکم شووشە عەترە بچووکە پیرۆزەکەی لە جانتاکەی دەرهێنا. بوتڵێک لە ئاوی گوڵەباغی باخچەکانی **مەککە**، دیارییەک کە باوکی بۆی هێنابوو. ئەوەی ڕاستی بێ بوتڵەکە بەتاڵ بوو، بەڵام وەک هەمیشە بە نووکی قامکی کەمێک عەتری لە قژە سپییەکانی دا و دەستی بە نزا کرد و بەتایبەت بۆ ڕۆنی پاڕایەوە.

ئەودەم دایکم هێشتا ڕۆنیی بە ڕووتی لەگەڵ مۆکا مۆکا نەبینیبوو. مانگێک دواتر، پاش بینینی ئەم دیمەنە ئیتر نەیدەویست سەیری کەڵەبابەکە بکا؛ ئەمە ئازاری دەدا.

"چیتر ناتوانم لەم ماڵەی تۆدا نوێژ بکەم کوڕم، کەڵەبابەکە کتوپڕ خۆی بە نێو نوێژەکانمدا دەکا."

هیچم لە دەست نەدەهات تاکو بۆی ئەنجام بدەم، جارجارە دەمبردە مزگەوتێکی مەغریبی، بەڵام ئەمە هیچ شتێکی لە باسەکە نەدەگۆڕی.

دەیگوت: "ئەم کەڵەبابە لە هەموو شوێنێ بە دوامەوەیە."

## ٥

**ڕۆنیٚ** ڕوخسەتی پیٚ دابووم کەی پیٚم خۆش بیٚ بچمە ماڵیان، تەنانەت ئەگەر دەرگەی دەرەوە کلۆم نەدرابایە، پیٚویستی نەدەکرد لە دەرگە بدەم.

زۆربەی کاتەکـــان بە دەرگەی پشـــتەوەدا دەچـــوومە ژووریٚ.

ئەو شەوە وەک هەمیشە چاویٚکم بە ژوورەوەدا خشاند و هاوارم کرد: "کەس لە ماڵە؟"

گویٚم لە دەنگی کەس نەبوو، بیٚدەنگییەکی تەواو زاڵ ببوو. بیرم کردەوە ڕەنگە **ڕۆنیٚ** لە نهۆمی سەرەوە بیٚ، بۆیە چـــوومە ژوورەوە. لە پڕیٚکـــدا هەردووکیـــانم لە ســـەر قەرەویٚڵەکە بینی، ڕووت نەبوون. کپ و ئارام، بە جلوبەرگ و پیٚڵاوەکانیانەوە لە تەنیشت یەکتری ڕاکشابوون. **ڕۆنیٚ** بۆینباخیٚکی پەپوولەیی گریٚ دابوو و **مۆکا مۆکـاش** بۆینباخیٚکی ئاسایی. سەریان شانەکراو، چاونووقاو و دەست لە سەر سینگ. ڕەنگیان بزرکابوو، دەتگوت دوو تەرمن و دانراون تا دوا ماڵئاواییان لیٚ بکریٚ.

**ڕۆنـــیٚ** چاوەکـــانی هەڵیٚنـــا. ئەوان نەمردبـــوون، بە جلوبەرگەوە خەوتبوون.

"هەڵەو **بولفەزل**!"
لە جێی خۆی هەستا.
هەوڵـم دەدا شـتێک بڵـێم، "بە بینینـی ئێـوە لە نێـو جلـی ڕێکوپێک و پێڵاوی بۆیەکراو لە پێدا، پێم وا بوو کە..."
ئەو شــتە نەبــوو کە دەمویســت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشــدا تێگەیشت.
**ڕۆنی** گوتی:
- خەوتبـووین. ئەوەی ڕاسـتی بـێ دەمانویسـت بچیـنە جەژنێکـی لەدایکبـوون، بەڵام دڕدۆنـگ بـووین، بچـین؟ نەچین؟ خۆمـان درێژ کردبوو بۆ ئەوەی کەمێک بیـری لێ بکەینەوە و خەومان لێکەوت.
- جا ئێستا چ دەکەن؟
- نـازانم، بە ڕاسـتی نـازانم بچـم یـان نـا. ڕێنـوێنیم بـکە **بولفەزل**، گەلۆ بچم باشە یان نا؟
- جەژنی لەدایکبوونی کێیە؟
- **ئانێک**؟
- **ئانێک** کێیە؟
- هاوســـەری پێشــووم. بــۆ ســـاڵیادی لەدایکبــوونی بانگهێشتی کردووین.
گوتم:
- ئەها! هاوسـەری پێشـووت؟ بـا کەمێک بیـر بـکەمەوە. چۆن دەتوانم ڕێنوێنیت بکەم؟ دەتـوانم چ بڵێم؟ سـەختە. بەڵام ئەگەر لە جێـی تـۆ بـوایەم، گـوێم لە دەنگـی دڵـم دەگــرت. ئەگەر گوتبــای بــڕۆ، یەکســـەر دەڕۆیشـــتم.

- قسەکەت جوانە، دەبێ گوێ لە دەنگی دڵم بگرم. دڵم توند لێ دەدا، زۆر توند لێ دەدا، بەکەفوکوڵە. دەی هاوڕێ، با بڕۆین.
ڕۆنێ وای گوت و هەستایە سەر پێ.
پێکەوە لە ماڵ ڕۆیشتنە دەر.
ئاخۆ لە لای ئێمە جارجارە پیاو پێکەوە لە سەر قەرەوێڵەیەک دەخەون؟
لە سەر قەرەوێڵەیەک نا، بەلام لە سەربانێک بۆچی. هەموو پێکەوە دەخەوتن.
شەوانە کە هەوا گەرم بوایە، پیاوەکانی ماڵی ئێمە دەچوونە سەربان. لەوێ لە پەنا یەکتری دەخەوتین، بە بێ قەرەوێڵە و لە سەر ئەرز.
شەوەکان چۆن تێپەڕ دەبوون؟
شەوەکان بەو جۆرە بوون کە دەبوایە ببن، شەوێکی ڕاستەقینەی خۆماڵی. ئێمەی پیاوانی ماڵەوە پەیژەیەکمان بە دیوارەوە دەنا، یەکەم کەس باوەگەورە سەردەکەوت. لەبەر ئەوەی ئەوەی من کوڕەگەورە بووم، پەیژەکەم دەگرت. باوەگەورە وەک هەمیشە بە شەپقەی سەری و گۆچانەکەی دەستیەوە، هێمنانە بە پەیژەکەدا سەردەکەوت.
لە سەربانەکە وەک کۆمەڵێک کۆلکەدار ڕادەکشاین.
- باوەگەورە، جارانیش وەک ئێستا هەمووتان لە تەنیشت یەکتری دەخەوتن؟

- ڕێک بەم شێوەیە بوو؛ من لەو جێگەیە دەخەوتم وا ئێستا تۆ لێی دەخەوی و باوەگەورەم لەم شوێنە ڕادەکشا کە من لەم ساتەدا خۆم لێ درێژ کردووە.
- ئەی کە پیاوان لە سەربان دەخەوتن، ژنانی ماڵێ لە کوێ بوون؟
- لە خوارەوە کوڕم. وەک ئێستا، ئەوان لە خوارێ دەمانەوە.

لە جێگەکەم دەهاتمە دەرێ، بە چارچەقڵی هەتا نزیک گوێسوانەکە دەچووم. مەراقم دەکرد بزانم ژنان لە کوێن، سەیری خوارەوەم دەکرد. دەمبیست لە نێو درەختەکانی باخچەکەدا دەجووڵێنەوە، بەڵام ئەوان ئاوێتەی تاریکی شەو ببوون، بە ڕادەیەک کە چیتر بۆم دەرنەدەکەوت ئەوەی دەیبینم ژنە یان نێوقەدی درەخت.

باوەگەورە دەیگوت: "با چایەک بێ کوڕم."

هاوارم دەکرد: "دایە! دایە! ئەوە لە کوێن؟"

ڕوخساری دایکم لە نێو تاریکیی ئەنگوستەچاودا دەردەکەوت.

ئێستا نزیکەی دوو ساڵ بوو ڕۆنیم دەناسی و زۆر جار دەچووم چاوم پێی دەکەوت، بەڵام تا ئەو ساتە هەرگیز کچەکەیم نەدواندبوو. گەلێک جار بە هەڵکەوت تووشم بە تووشی ببوو.

دەیگوت:

- هەلەو.

- هەلەو.

وام دەگوت و بە ڕێگەی خۆمدا دەڕۆیشتم.

حەزم دەکرد قسەی لەگەڵ بکەم، بەلام قسەم لەگەڵ نەدەکرد. ئەو کچی ڕۆنی بوو، من دەبوایە بەو ماڵە کە هەر کات پێم خۆش بوایە سەرم دادەخست و بێ وادەی دیاریکراو ڕووم تێ دەکرد، وەفادار بمێنمەوە. بۆیە "هەلەو"ێک بەس بوو. بەلام دەمزانی کە ئەو چاودێریی هەڵسوکەوتەکانم دەکا؛ ئەگەر شەوانە چووبامە ناو باخچەکە و جگەرەیەکم کێشابا، دەمزانی لە پەنجەرەی نهۆمی سەرەوەڕا تەماشام دەکا، یان ئەگەر چووبامە ژووری و لەگەڵ ڕۆنی لە سەر مێزە دارینەکە دانیشتبام، یەکسەر لە ژوورەوە گوێم لە دەنگی هەنگاوەکانی دەبوو، گوێم لێ دەبوو ژووری خەوتنەکەی جێ دێڵێ و هێمنانە بە پلیکانەکاندا دێتە خوارێ. لە سەر نووسراوەکەی بەردەمم قووڵ دەبوومەوە و تاوناتاوێ لە ڕۆنیم دەپرسی بۆچی فلان یان فیسار ڕستە تەواو نییە، سەرنجم دەدا کە ئەو دەرگەیەی دەیڕوانییە پلیکانەکان بە ئەسپایی دەکرایەوە. دەمزانی ئەگەر سەر هەڵبڕم و سەیری دەرگەکە بکەم، لە ئاوێنە هەڵواسراوەکەی دیواری دالانەکەوە چاوم بە نیوەی ڕوخساری دەکەوێ.

هەمیشە حەزم دەکرد لەو کاتەدا کە پیاوەکان لە خوارەوە پێکەوە نووستبوون، بە پلیکانەکاندا سەرکەوم،

دەرگەی ژوورەکەی بـــکەمەوە و ســـەیری بـــکەم لە سەرەوە تەنیا لە نێو قەرەوێڵەکەیدا خەوتووە.

بەڵام جێگەی من لە نێو پیاواندا بوو، لە کن **ڕۆنی** و پیاوەکەی تر، واتە **مۆکا مۆکا**، کە زۆربەی کاتەکان بزر بوو و تەنیا بۆ خەوتن لە سەر قەرەوێڵەکە دەگەڕایەوە.

شەوێک بە هیوای بینینی چوومە ماڵەوەیان، دەمزانی **ڕۆنی** لە ماڵ نییە. هێمنانە دەرگەی داڵانەکەم کردەوە و پرسیم: "کەس لە ماڵە؟"

گوێم لە هیچ نەبوو، ویستم بچمە سەری، بەڵام نا، لە شـوێنی خـۆم نەبـزووتم. ویســتم دیسـان دەنگـم بەرز بکەمەوە و بڵێم "کەس لە ماڵە؟" بەڵام پاشگەز بوومەوە.

جارێک بەس بوو.

- **ڕۆنی، میەترا** لە کوێیە؟ ئیتر نایبینم.

- **میەترا**؟ ئەها، مەبەستت **میراندایە**؟ ڕۆیشت.

هەستم کرد حەز ناکا لەم بارەوە قسە بکا. شتێکی تایبەت بوو، بۆیە نەدەبوایە خۆمی تێهەڵبقورتێنم.

لەگەڵ ئەوەدا لە **مۆکا مۆکاشم** پرسی.

"دەزانی **میراندا** لە کوێیە؟"

گوتی: "ڕۆیشتووە. ڕۆیشت و ئەم ماڵەی جێ هێشت."

ڕۆیشتن و سەرهەڵگرتن سروشتی سەرجەم ئەو ژنانە بوون کە ناسیبوومن؛ من بەردەوام پاسکیلێک، پاسێک، شـــەمەندەفەرێک یـــاخود فـــڕۆکەیەکم بە دوای خۆمـــدا ڕادەکێشا، کە ژنێکیان هەڵگرتبوو و بەرەو دوور دەیان برد.

**میراندا** به چ کەرەستەیەک ڕۆیشتبوو؟
سەرەتا به پاسکیل و ڕەنگە دواتر بە شەمەندەفەر ڕۆیشتبێ.
سواری پاسکیلەکەم بووم، هەر ئەو پاسکیلەی ڕۆنی پێی دابووم، پاشان ملی ئەو ڕێگەیەم گرت کە تایبەت بوو بە پاسکیل ئاژۆتن. کە گەیشتمە چراکانی ترافیک، ڕاوەستام. مافی ئەوەم نەبوو درێژە بە ئاژۆتن بدەم. شوێنی من ماڵەوە بوو، دەبوایە لە ماڵەوە بمێنمەوە.
جاران دایکم هەمیشە دەڕۆیشتە دەرێ، بەردەوام دەڕۆیشتە دەرێ.
"دەچیتە کوێ دایە؟"
خۆی لە چارشێوەکەی وەردەپێچا و دەیگوت:
- دەچمە مزگەوت.
- دەتوانم لەگەڵت بێم؟
- بەداخەوە نا. تۆ پیاوێکی پێنج ساڵەی، دەبێ بچیتە بەشی پیاوان.
- به پێیان وا دەتەوێ بچیتە کوێ دایە؟
لەچکە ڕەشەکەی دەپۆشی، دەسماڵە کەسکەکەی بە خۆیدا دەدا، پێڵاوە گەورەکانی دەکردە پێ و دەیگوت:
- دەچمە چیا بۆ زیارەتی داری چاکی.
- دەتوانم لەگەڵت بێم؟
- نا ڕۆڵە، تۆ دەبێ لە لای پیاوان بمێنیتەوە.

- دەچیتە کوێ دایە؟

- دەچمە سەر گۆڕی دایکم ڕۆڵە.
- ئێستا؟ بەم شەوە؟
- ئا، دەچم هەندێک خورمای پیرۆزی بۆ بەرم.
- ئەمنیش دێم.
- نابێ، لە کاتی پێدانی خورمای پیرۆزدا نابێ هیچ پیاوێک لەو دەوروبەرە بێ.
ئەم جارەش دایکم سەرلەنوێ ڕۆیشت.
ئەو بەرەو ماڵەوە فڕی، هەمدیس مافی ئەوەم نەبوو هاوڕێیەتیی بکەم. دەبوایە دیوار بە دیواری ماڵی ڕۆنی درێژە بە ژیان بدەم.

٦

"بولفەزل! دێی پێکێک بخۆیتەوە؟" ڕۆنیّ بوو گازی کردم.

"بەڵێ، ئەوە هاتم."

چاکەتە گەورەکەم پۆشی و کاسکێتێکم لە سەر کرد.

پرسی:

- لە باخچەکە دابنیشین؟

- ئێستا؟ بەو هەوا ساردە؟

دوو کورسیی لە باخچەکە دانا، پاشان چەندین بوتڵی هێنان.

سەری شووشەیەکیانی کردەوە و ئاوەکییە ڕەنگ قاوەییە تۆخەکەی کردە نێو پەرداخەکانەوە. مێزی دانەنابوو، ڕۆنیّ بوتڵەکەی لە سەر چیمەنەکە دانا، لە سەر چیمەنە ساردەکە.

لە ژوور سەرمان مانگ تریفەی دەهاویشت، بەڵام لە دوورەوە هەورەکان خەریک بوو بە دووی یەکدا دەهاتن. لێرەولەوێ چەند ئەستێرەیەک دەگەشانەوە.

ڕۆنیّ پرسی:

- ئێوەش جارجارە شەوگەلی وا ڕووناکتان هەیە؟

- لە لای ئێمە شەوەکان ڕووناکن.
- ئێوەش ئەستێرەتان هەیە؟
- زۆر، وەک خیز و خۆڵ.
- چین‌چین.
ڕۆنیێ پیکەکەی بەرز کردەوە.
گوتم: "بە خۆشیت."
ڕۆنی پرسی:
- ئاخۆ لە وڵاتەکەی تۆش ئەو ئەستێرەیە دەبینرێ کە دەخووشێ؟
- بە دڵنیاییەوە. بە هۆی ئەوەی شەوەکان ڕووناکن و بە میلیارد میلیارد ئەستێرە لە بان سەرمان دەدرەوشێنەوە، زۆر جار چاوت بە کۆمەڵێک ئەستێرە دەکەوێ کە لە یەک کاتدا دەخووشن. لە ڕاستیدا وەک چۆن لە وڵاتی ئێوە فڕۆکە دەکەون، لە وڵاتی ئێمەش ئەستێرەکان ئاوا بەر دەبنەوە.
- مەبەستت چییە؟
- ئەها، هیچ. کتوپڕ بیرم بۆ شوێنێکی تر چوو.
ئەوەی ڕاستی بێ، من لەو ساتەوەختەدا لەسەر کورسی و لە نێو باخچەکەدا دانەنیشتبووم، بەڵکو لە سەر بانیژەی ماڵی باوکم بووم. دانەنیشتبووم، ڕاکشابووم.
ئێمە لە تەنیشت یەکتری ڕاکشابووین، کتوپڕ ئەستێرەیەکم بینی ڕاخووشی.
بە باوەگەورەم گوت:

- بڕوانە! ئەو ئەستێرەیە!
- دوانن. ئەستێرەیەک نییە.
- ئەستێرەیەکە. بەربووەوە، بۆ خۆم بینیم.
- فڕۆکە بوو.
- فڕۆکە؟
- ئـا، بەڵام بەر نـابێتەوە، شـۆڕ دەبێـتەوە. دەیەوێ بنیشێ.
ڕۆنێ پرسی:
- ئاخۆ لەوێ جارجارە پێکێ شەراب دەخۆنەوە؟
- نـا، شـەراب نـاخۆینەوە. لە مـاڵێ چـا دەخـۆینەوە، سـەماوەری چـا بەردەوام قـوڵتەی دێ و هەمیشـەش پێنج، شەش تا حەوت پەرداخ لە سەر سینییەکی زەردی مس دانراون.
کە دەچووین لە سەربان دەخەوتین، لەوێوە دەمقیژاند: "دایە! دایە! دایە ئەوە لە کوێی؟"
دایکم وەڵامی دەدامەوە:
- چ بووە ڕۆڵە؟
- چادانە چایەکمان بۆ ناهێنی؟
دایەگەورە لۆمەی دەکردم: "بۆچی هێندە بانگی دایکت دەکەی؟ تەماشـا کە ڕۆڵە! ئەوەنـدە بەسـە تەنیـا جارێک بانگی ژنان بکەی، پاشان دەبێ وازیان لێ بێنی. ئەگەر خۆیان حەزیان لێ بوو، ئەوا یەکسەر دێن."
ڕۆنـێ پرسـی:- ئێـوەش جارجـارە هەوڵتـان دەدا لەگەڵ جیرانەکانتان لە باخچەکە شتێک بخۆنەوە؟

- لەگەڵ پیاوەکانی ماڵەوە بەڵێ، بەڵام لەگەڵ دراوسێکان نا.
- قەت؟
- نەک بڵێی "قەت"، جارجارە، ناوەناوە هەڵدەکەوت، بەڵام لە نێو باخچە و سەربان نا، لە ژووری و لەودیوی دیوارەکان.
- لەودیوی دیوارەکان؟
- بەڵێ. لە نێوان ئێمە و جیرانەکانماندا پەرژین بەدی ناکەی، بەڵکو دیواری بەرز و قایم هەن.
- ئەی ژنەکان؟
- ژنەکان بە پێچەوانەوە، لەگەڵ دەرودراوسێ لە باخچە دادەنیشتن.
- چۆن لە باخچە دادەنیشتن؟
- وەک ئێستا ئێمە چۆن دانیشتووین، لەگەڵ داهاتنی تاریکی و شەودا.
هێشتا نیوەی یەکەم پەرداخەکەم نەخواردبووەوە، کە ڕۆنی پاشماوەی بوتڵەکەی بەتاڵ کرد؛ سەری شووشەیەکی نوێی هەڵپچڕی.
گوتی:
- کەوابێ پەیوەندییەکی ئەوتۆ لە نێوان پیاوان و ژناندا نەبوو.
- بۆچی، پەیوەندییەکی ڕاستەقینە لە نێوان پیاوان و ژناندا هەبوو.

- نـا، مەبەسـتم ئەوەیە کە پەیوەنـدیی نێـوان پیـاوان و ژنانی جیران مەحاڵ بووە.
- واش نا، ژن دەیتوانی سڵاو لە پیاو بکا.
- هەر سڵاو و هیچی تر؟
- نازانم. من بەس سەبارەت بە ژنانی بنەماڵەکەم قسـە دەکەم.
- ئەگەر سـڵاو تـاکە ڕێگەی پەیوەنـدیی نێـوان ژنـان و پیاوان بێ، تۆ چۆن توانیت لەگەڵ کچەکەی جیرانتـان کە عاشقی ببووی، قسە بکەی؟
- قسەمان نەدەکرد، دەرفەتی ئەوەمان بۆ نەدەڕەخسا.
- ئەی چیتان دەکرد؟
- سەیری یەکترمان دەکرد، لە یەکترمان دەڕوانی.
- بەڵام کە دیـــوارە تۆکمەکـــان لێکیـــان دادەبـــڕین چۆناوچۆن دەتانتوانی سەیری یەکتری بکەن؟
- پەیژەیەکم بە دیوارەکەوە دەنا و دەچوومە سەربان.
ڕۆنی یەکێکی تر لە پەرداخەکانی بەرز کردەوە.
گوتی: "چین‌چین!"
بە هێمنـــــــــی پەرداخەکەم لە پەرداخەکەی ئەو دا و قوومێکم هەڵقووڕاند.
- کەس نەیدەپرسی ئەم کوڕە لەو سەربانە چ دەکا؟
- لە ســـەربان کـــۆترم هەبـــوون، بە ســـاکێ گەنـــمەوە دەچـــوومە ســـەربان. کۆترەکـــان بە گمەگـــم لە ســـەر شانەکانم هەڵدەنیشتن.
- ئەی ئەو کچە گەنجە؟

- دەچووە پشت پەنجەرەی ژوورەکەی.
- ئەی ئەگەر شەو بوایە؟
- ئەگەر شەو بوایە، بە هێمنی پەنجەرەکەی دەکردەوە.
- ئەی پاشان؟
- پاشان؟ ئێمە نەماندەتوانی بە ئاسانی لەگەڵ ئەو ژنانە قسە بکەین کە خۆشمان دەویستن.

هەوای دەرەوە سارد بوو، بەڵام ئەو شەرابەی لەگەڵ **ڕۆنی** خواردبوومەوە جەستەی گەرم کردبووم. ئەو هەورانەی سەرەتای شەو دوور بوون لێمان، ئێستا لە بان سەرمان لەنگەریان گرتبوو. چەند دڵۆپە بارانێک ڕژایە نێو پەرداخەکەمەوە.

منیش بە نۆرەی خۆم کۆمەڵێک پرسیارم لە **ڕۆنی** هەبوو. بە هۆی ئەوەی نزیکی پیاوان دەبووەوە، مەراقم دەکرد بزانم چ جۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵ ژناندا هەیە:

"ئاخۆ عاشقی ژنانیش بووی؟"

"ئەمە لە سەردەمی گەنجێتیدا بە چ شێوەیەک بووە؟"

"یەکەم جار ژنەکەی پێشووت چۆن بینی؟"

بەڵام کە پرسیار دەورووژن، پەنابەرێک هەمیشە بە پارێزەوە هەڵسوکەوت دەکا.

بەردەوام حەزم دەکرد لێی بپرسم: "ئادەی پێم بڵێ، ئەو یەکەم شەوەی تۆ چوویت و هاوسەرەکەی پێشووت بینی، چۆن تێپەڕی؟"

بەڵام خۆم لە پرسیارەکە بوارد، بێ کەڵک بوو. توانای وێناکردنی ئەوەم هەبوو بزانم چ ڕوو دەدا ئەگەر

کۆنەمێردێک شانبەشانی پیاوێک بچێتە ماڵی ژنە کۆنەکەی، پیاوێک کە لە سەر قەرەوێڵە و لە تەنیشتی دەخەوت، لەو شوێنەی وا پێشتر ژنەکە داگیری کردبوو.

هەمدیس جگەرەیەکی گەورەی پێچایەوە و دای گیرساند، مژێکی قووڵی لێدا و لە کاتێکدا دووکەڵەکە لە زارییەوە دەهاتە دەر، قومێک لە شەرابەکەی هەڵقووڕاند.

ئیتر دڵۆپەکانی باران بە زولاڵی دادەبارینە سەر بوتڵە بەتاڵەکان. بوتڵەکان لە بن پێم و لە سەر چیمەنەکە بوون، بەڵام دەنگێکم دەبیست، دەنگی دڵۆپەکانی باران لە پشت سەرم. ئاورم دایەوە و لە نێو تاریکیدا کۆمەڵێک بوتڵی بەتاڵم بینی. بوتڵەکان ئامادەی ڕۆیشتن بوون، بۆ ئەوەی ملی سەفەر بگرن. سەفەری بوتڵە بەتاڵەکان.

## ٧

**مۆكا مۆكا** زۆر بە دەگمەن لە ماڵی **ڕۆنیّ** دەمایەوە، لەوانەش بــوو زۆر بمێنێــتەوە. دەرفەتــی ئەوەم بــۆ نەڕەخسابوو لەگەڵی بدوێم، ئەوەی ڕاستی بێ حەزم نەدەکرد. **ڕۆنیّ** جیرانی من بوو، بەڵام نەمدەتوانی بە چاوی جیران سەیری **مۆکا مۆکا** بکەم. ڕوخساری، چاوچاوێنی، ئەو ددانە زەردانەی بەردەوام پاشماوەی خۆراکیان تێدا دەمایەوە و هەناسەی کە بۆنی نیکۆتین و گۆشتی ماوە بەسەرچووی لێوە دەهات، ئەمانە هەر هەموویان **ئەسغەرە کەچەڵ**یان بە بیر دێنامەوە، ئەو کەســەی لە دێهاتەکەمــان دوای کوڕێژگــان دەکەوت. ئەگەر زانیبــام **مۆکــا مۆکــا** لە مــاڵە، وە ژووریّ نەدەکەوتم. ئەو دەهات و دەڕۆیشتەوە. بۆچی دەهات؟ بۆچی دەڕۆیشتەوە؟ نازانم. لە ڕوانگەی منەوە تەنیا هــاوڕێی **ڕۆنیّ** بوو و هیچی تر، بەڵام لە ڕوانگەی دایکمەوە ئەو سەمبۆلی **هۆڵەندا** بوو. قەت پێویستیم بەوە نەبوو بزانم لە سەر کام قەرەوێڵە دەخەویّ، هەروەهــا هــاوڕیّ نوێیەکەی کێیە. بەڵام شتێک لە مێشکمدا ڕوون و ئاشکرا بوو، **مۆکا مۆکا** هاوکات

لەگەڵ دایکم ڕۆیشت. ئەو جانتاکەی هەڵگرت و لە نێو فڕۆکەدا لە تەنیشت دایکم دانیشت، لەگەڵی چوو بۆ ماڵی خۆمان تا مۆتەکەی پێ بدا.
ڕۆنی ئیتر تەنیا دەخەوت، دەبوایە لە ماڵی خۆی بمێنێتەوە. ئەمە قەدەری ئەو بوو و نەیدەتوانی بیگۆڕێ، منیش بە هەمان شێوە.
کۆمەڵێک شتی ئەوتۆ هەن کە مرۆڤ لەگەڵیاندا هیچی پێ ناکرێ؛ ڕۆنی سەرباری ئەو هەموو هەوڵ و تەقەلایەی دەیدا، هەمدیس لە هەموو بوارێکەوە شکستی دێنا. لە پشت مێزە دارینەکەی دادەنیشت و پەیتاپەیتا نامەی دەنووسی، نامەی داواکاری بۆ دامەزراندن.
لێم دەپرسی:
- بەدووی چ کارێکدا دەگەڕێی ڕۆنی؟
- نازانم، بە ڕاستی چیتر نازانم.
منیش هەروا، نەمدەزانی. من بێگانەیەک بووم و تەنیا چیرۆک و بەسەرهاتم لە مێشکدا بوو. ئەوەی ڕاستی بێ دەبوایە پێی بڵێم: "ڕۆنی، نامەنووسین بەسە! بڕۆ سەفەرەکەت بکە."
دەبوایە پێم گوتبا، چونکە من چیرۆکی **کەریمە شێتم** دەزانی و ئەو نا.
**کەریمیش** بەردەوام لە ماڵی خۆیان بوو، وەک ڕۆنی لە پشت مێزێکی دارین دادەنیشت. بێ پسانەوە نامەی بۆ دڵدارەکەی دەنووسی، کە لە گوندی **زەواران** لەودیو

چیایەکی سەرکەش دەژیا. ڕێبوارەکان ئەو نامانەیان بۆ دەگواستەوە کە بۆ دڵدارەکەی دەنووسی.
بێگومـــان چیـــا ســـەخت و هەزار بە هەزارەکە هەبـــوو، بەڵام ژنێـک لە گـۆڕێ نەبـوو. ئەم دڵـدارە دەسـتکردی خەڵکی دێ بوو تاکو گاڵتە بە **کەریمە شێت** بکەن. هەر کە کەسێک چاوی پێ دەکەوت، هاواری دەکرد: "**کەریم**، ئەوە هێشـتا نەڕۆیشـتووی؟ پـێم وا بـوو دەمـێکە ڕێـی سـەفەرت گرتـووەتە بەر." بەڵام **کەریـم** زاتـی نەدەکـرد، چیـــا عاســـێیەکە وەک دێـــوزمەیەک لە نێـــوان ئەو و گراوییەکەیـدا قـووت ببـووەوە. دواجـار پیرەمێردێـک پەنـدی دادابـوو: "**کەریـم**، بەس نـامە بنووسـە. بە دوای خۆشەویستەکەتدا بڕۆ."
من بەسەرهاتەکەم بۆ **ڕۆنێ** نەگێڕایەوە. چ سوودێکی هەبوو، **ڕۆنێ**ش جگە لەمە نەیدەزانی هیچی تر بکا. پاش تێپەڕبوونی چەند مانگێک دواجار قەڵەم جافەکەی دانـا، ســواری پاسـکیلەکەی بـوو و ڕۆیشــت تــاکو گونــدی **زەواران** بدۆزێتەوە.
ســـەرەتا منـــیش هەمیشـــە لە مـــاڵێ بـــووم، بەڵام بە مەبەســتی دامەزرانــدن نــامەم نەدەنووســی. هێشــتا نەگەیشــتبوومە ئاســتێک بتــوانم بە هۆڵەنــدی نــامەیەک بنووسم. هیوابڕاوانە پێم وا بوو مەحکومم بەوەی دەبێ بـۆ هەتاهەتـایە لە نێو فەرهەنـگە کۆنەکەی **ڤـان دال** بە دووی واتای پەیڤەکاندا بگەڕێم.

بەڵام ئەم بێکارییەی من ماوەیەکی کورتی خایاند، ڕۆژێک ڕۆنی کتوپڕ لە پێش پەنجەرەکەمان دەرکەوت.
بە ئاماژە تێی گەیاندم دەرگەی لێ بکەمەوە.
دەرگەکەم کردەوە.
- زوو وەرە! کارێکم بۆ تۆ دۆزیوەتەوە، کارێکی بچووک.
- کار؟ بۆ من؟
- بەڵێ، بۆ تۆ.
ڕۆنی وای گوت و منیش لە دڵی خۆمدا گوتم بۆچی ئیشی بۆ خودی خۆی نەدۆزیوەتەوە.
ڕۆنی درێژەی بە قسەکانی دا:
- سەبارەت بە تۆ قسەم بۆ پیاوێک کردووە، ڕەنگە سەر بگرێ.
- بەڵام هێشتا هۆڵەندییەکەی من زۆر باش نییە.
- گرنگ نییە. خێرا، لەگەڵم وەرە هاوڕێ.
پاسکیلەکەم هەڵگرت و بە درێژایی کارێزەکەدا دوای کەوتم. پاش تێپەڕاندنی پردێکی دارین، بە سەر توولەڕێیەکی قەراغ مەزراکاندا پێدالمان لێ دا. دوای چارەکاتژمێرێک بە لای ڕاست و بە ئاڕاستەی مەزرایەکدا کەوتینە نێو ڕێگەیەکی بێ دەرچوون. لە دووماهیی ڕێگەکەدا لەتەکارتۆنێک وەک تابلۆیەک بە دارێکەوە هەڵواسرابوو، کە بە خەتێکی خواروخێچ بەڵام شیاوی خوێندنەوە لە سەری نووسرابوو "پێویستمان بە خزمەتکارێکی شیلگیرە".

مەزرایەکی کۆن بوو و پاڵی بە بەنداوەکەوە دابوو، لە پاسکیلەکانمان هاتینە خوار و درێژەی ڕێگەکە بە پێیان چووین. سەگی پاسەوانی مەزراکە بە حەوتەحەوت بەرەو پیرمان هات، من زاتم نەدەکرد لەوە زیاتر بچمە پێشێ. وەرزێرێکی پیر لە بەردەم دەرگەی کادێنێک خوویا بوو.

هاواری کرد: "وەرە ئێرە!"

سەگەکە بە ڕاکردن بۆ لای خاوەنەکەی گەڕایەوە.

وەرزێرەکە ڕۆنیی ناسییەوە.

ڕۆنی بە وەرزێرەکەی گوت: "ئەمەش ئەو پیاوەی بۆم باس کردبوون."

پێڵاوێکی دارینی لە پێ بوو و بە هەنگاوی قورس بەرەو پیرمان هات.

وەرزێرەکە بێ ئەوەی قسەیەک بکا، نیگایەکی لە دەستەکانم بڕی. بە دڵی نەبوو، دەستەکانم بەو شێوەیە نەبوون کە ئەو دەیویستن.

بە شێوەزارێکی قورس گوتی: "تۆ بێگانەی."

تێنەگەیشتم ڕستەکە پشتڕاستکردنەوەیە یان پرسیار.

ڕۆنی گوتی: "بەڵێ، بێگانەیە. دیارە هێشتا نازانێ باش بە هۆڵەندی قسە بکا."

وەرزێرەکە ناهومێدانە تەپۆڵکەیەک زبڵوزاڵی لە بەردەم کادێنەکە پیشان دا و گوتی: "دەبێ بە هەشت ڕۆژ ئەمە هیچی نەمێنێ. ئەوەندەی پەیوەندیی بە منەوە هەبێ، دەتوانی هەر لە ئێستاوە دەست پێ بکەی."

سەیری تەپۆڵکەکەم کرد، کۆگایەک شیاکە و کەمرە بوو و پووش و پەڵاش دەوری دابوو.

**ڕۆنی** گوتی: "دەرەقەتی دێ. وا نییە **بولفەزل**؟ دڵنیام دەتوانی جێبەجێی بکەی."

وەرزێرەکە دەستە پان و پۆڕەکانی بەرەو لای من ڕاداشت.

پرسی: "کەواتە بەڵێ؟"

**ڕۆنی** گوتی: "بیکە **بولفەزل**، بە قازانجتە. نابێ بەردەوام لە ماڵێ لە نێو کتێبەکانتدا بمێنیتەوە. بیکە."

دڕدۆنگانە دەستم درێژ کرد.

بە وەرزێرەکەم گوت: "باشە."

دەتگوت ئەم تەپۆڵکە تەپاڵەیە، ئەم شاخە پاشەڕۆکە بە درێژایی چەندین ساڵ چاوەڕوانی هاتنی من بووە. وەرزێرەکە چوو لە تەویلەوە فەرغوونێکی بۆ هێنام، پێمەڕەیەکی گەورەی دامێ و گوتی: "لە پشت ئەم مەزرایە، قووڵکەیەکی گەورە هەیە. دەبێ ئەم پاشەڕۆکە لەوێ فڕێ بدەی."

نەتدەتوانی ڕاستەوخۆ ئەم تەپۆڵکەیە بۆ نێو قووڵکەکە بگوازیتەوە، چونکە دیوارێک لێکی دادەبڕین. دەبوایە فەرغوونەکەم بە شوێنێکدا سەر خستبا کە بەرەو بەنداوەکە دەچوو، پاشان ڕێگەیەکم بە ئاراستەی بەنداوەکەدا بڕیبا و ئینجا شۆڕ ببامەوە و فەرغوونەکەم لە نێو قووڵکەکەدا بەتاڵ بکردایە.

وەرزێرەکە پرسی:

- تێگەیشتی یان نا؟
- تێگەیشتم.

قۆڵم لێ هەڵماڵی. هەموو جارێ فەرغوونەکەم پڕ دەکرد، بە سەراولێژییەکەدا پاڵم پێوە دەنا، دەگەیشتمە سەرێ، ڕێگەی ڕووەو بەنداوەکەم دەبڕی، ئینجا تا قوولکەکە شۆڕ دەبوومەوە و دەگەڕامەوە؛ مەلە دەریاییەکان هەر لە تەپۆڵکەکەوە تا قوولکەکە هاوڕێیەتییان دەکردم.

وەرزێرەکە بۆ ژەمەخواردنەکانم پەتاتەی کوڵاوی پێ دەدام.

سێیەم ڕۆژ گوتی:

- کارەکە باش دەچێتە پێشێ.
- بەڵێ، باش دەچێتە پێشێ.

ڕێک هەفتەیەک دواتر هیچ لەو پاشەڕۆکە نەمابووەوە. ئەو ساتەی وا خەریک بووم پاڵم بە دوا فەرغوونەوە دەنا، وەرزێرەکە لەگەڵ پیاوێکی تری خاوەن مەزرایەکی دیکە هاتە لام.

وەرزێرەکە بە پیاوەکەی تری گوت: "کەسێکی شێلگیرە."

ئینجا ڕووی لە من کرد و گوتی: "سەیر کە! ئەم جیرانەش تەپۆڵکەیەک پاشەڕۆکی هاوشێوەی هەیە، لێم تێدەگەی؟"

وەڵامم دایەوە:

- بەڵێ، لێتان تێدەگەم.

- ئایا دەتەوێ هیی ئەویش خاوێن بکەیتەوە؟
بەیانیی ڕۆژی دواتر، بە هەمان فەرغوون و هەمان پێمەڕە ڕۆیشتمە مەزراکەی ئەولاتر، کارەکەی ئەوێش هەفتەیەکی پێ چوو. دوایین ڕۆژ وەرزێرێکی دیکە هات، دەیویست بزانێ ئاخۆ دەتوانم تەویلەکەی ئەویش خاوێن بکەمەوە یان نا. ئا بەم جۆرە بۆ کارکردن لە مەزرایەکەوە دەچووم بۆ مەزرایەکی تر، کە دواجار پاش سێ مانگ گەڕامەوە بۆ سەر کتێبەکانم، بۆم دەرکەوت ڕۆنێ لەوێ نییە.
هیچ شتێکی ژووری ڕۆنیشتنی نەگۆڕدرابوون، هەموو کەلوپەلەکان هەروا لە جێگەی خۆیان بوون. لەگەڵ ئەوەشدا هەستم دەکرد پەیوەندیی نێوان من و وی بۆ هەمیشە هەڵوەشاوەتەوە، دەمزانی چیتر ناتوانم بۆ وەلامدانەوەی پرسیارەکانم پشتی پێ ببەستم.
"ڕۆنێ! کام لەم وشە پێکلکاوانە دروستە: Bergmest یان Mestberg؟"
"ڕۆنێ! چۆن دەتوانین بیرۆکەی ڕۆیشتن و جێهێشتنی بۆشاییەک دەرببڕین؟"
"ڕۆنێ! من هێشتاش نازانم دەبێ کام لەم دوو وشانە هەڵبژێرم، پەیوەندی یان کۆنتاکت؟"
پەیوەندیم لەگەڵ ڕۆنێ هەڵوەشابووەوە، گفتوگۆی ڕاستەقینە کۆتاییان هاتبوو. بە دووی نیشانەیەکدا دەگەڕام ئەم هەستەم پشتڕاست بکاتەوە. قەرەوێڵەکە هەر وا لە بن پەنجەرە بوو، وێنەکان هەر وا بە

دیـــوارەوە هەڵواســـرابوون، مێــزە داریــنەکە هەر وا لە شوێنی خۆی بوو، دەرگەی دالآنەکە نیمچەکراوە بــوو و ئـــاوێنەکە بە دیـــواری دالآنەکەوە هەڵواســـرابوو، ئەو ئاوێنەیەی چیتر دیمەنی **میەترای** نەدەگواستەوە.

دەچـوومە نێـو بـاخچە پـاییزییەکەوە و لە نێـو چیمەنـی زوقمگرتـــوودا، ســـەرم بەرەو پەنـــجەرەکە هەڵـــدەبڕی. بـــایەکی تونـــدی دەهـــات، هەوا ســـارد بـــوو و لەناکـــاو ساردتریشی کرد. گوێم لە جیڕەجیڕێکی تێکەڵ بە گڤەی با دەبوو، وەک ئەوە وا بـوو دەرگەیەکی ژەنگاوی لێک بکرێتەوە و دەنگێکی وشک چێ بکا.

"ئەها کەڵەبابەکە، کەڵەبابە ئاسنینەکە."

بـا هەوڵـی دەدا کەڵەبـابە ئاسـنینەکەی سـەر بـانیژەی گەنجینەکە بجووڵێنێتەوە. مـات و حەیـران لە کەڵەبـابەکە ڕامام، کەڵەبابە ژەنگاوییەکە هێدیهێدی بە سەر بـازنەی خۆیدا دەسووڕاوە.

**ڕۆنی** بەم زوانە نەدەگەڕایەوە.

پاســکیلەکەی لە گەنجیــنە بـــوو، بە پێیـــان ڕۆیشـــتبوو. پاشان سواری پاس ببوو، ئینجا ڕەنگە شـەمەندەفەر. لە ئاکامدا بێگومان کەوتووەتە ڕێ.

## ٨

هـاوین مـاوەیەک بـوو بەسـەر چووبـوو، بە شـێوەیەک ڕۆیشـتبوو کە هـیچ شـوێنەوارێکی لـێ بەجـێ نەمـابوو. خەزان بە با ساردەکەی دەستی پێ کردبوو.

خودایە، **ڕۆنێ** دەبێ چی بەسەر هاتبێ؟

جیرانەکـان حەزیـان نەدەکـرد سـەبارەت بەو شـتێک ببیستن. لە دەرگەی جیرانەکەی ئەولاتری مـاڵی **ڕۆنـێ**م دا:

– بەڕێز، ئاخۆ نازانن **ڕۆنێ** چووەتە کوێ؟

– نەخێر. چۆن دەبێ بزانم؟

پەنـام بـۆ خەڵکـانی بەرامـبەر بـرد، بـۆ ئەو ژنـانەی بەگشتی هەموو ڕۆژێ لە پشت پەنجەرەکانەوە سـەیری دەرەوەیان دەکرد.

– خاتوون، نازانن **ڕۆنێ** چۆتە کوێ؟

– کام **ڕۆنێ**؟

– **ڕۆنێ**، **ڕۆنێ**ی جیران، کە بەرامبەر بە ماڵەکەی ئێوە دەژیا.

– نەخێر، نازانم. بۆچی دەتانەوێ بزانن؟

– هەر وا. تەنیا کەمێک نیگەرانم.

- بۆچی؟ لەبەر چ هۆکارێ؟
- بەس لەبەر ئەوەی مـــــاوەیەکی دوورودرێـــــژە ڕۆیشتووە و لێی بێ هەواڵم.
زاتم نەدەکرد دەرگەی جیرانەکانی تر بکوتم، ئەگینا بە خۆیـان دەگـوت: "ئەم پیـاوە باسـی چـی دەکـا؟ چ پەیوەندییەکی بەوەوە هەیە **ڕۆنێ** دەگەڕێتەوە ماڵێ یان نا؟"
بێجگە لەوانە دەمتوانی لە کێی تر بپرسم؟ لە کابرای سەوزەفرۆشـم پرسـی کە بە ئۆتـۆمبێلەکەی بە گەڕەکدا تێپەڕ دەبوو.
- کاکە، زەحمەت نەبێ دەتوانم پرسیارێ بکەم؟
- فەرموو.
- **ڕۆنێ**...
- کام **ڕۆنێ**؟
- جیرانەکەم، هەر ئەو کەسـەی جارجـارە سـەوزەتان پێ دەدا. مـاوەیەکی درێژە بێ سەروشوێنە، نیگەرانـی بووم، ئاخۆ نازانن لە کوێیە؟
فرۆشیارەکە گوتی:
- ڕەنـگە لە پشـوو بـێ، وا نیـیە؟ بـۆی هەیە چـووبێتە پشوو.
- ئێسـتا و پشـوو؟ لەمێـژە هەمـوو کەس لە پشـوو گەڕاوەتەوە.
- نیگەران مەبن، دەگەڕێتەوە.

ئەوە بۆ دوو مانگ دەچێ منداڵەکان چوونەتەوە قوتابخانە، شەوان هەموو زۆپاکانی گەڕەک دادەگیرسێن، بەڵام **ڕۆنی** هێشتا نەگەڕاوەتەوە.
هەڵووژەیەک نەبێ، ئەوانی تر هەموو لە درەختەکە بەربوونەتەوە. دوایین هەڵووژە، شینێکە لە ڕەنگی شەو و هەر وا بە لقەکەیەوە ماوەتەوە.
شەوێک لە سەر جێگەکەم ڕاکشابووم و بۆ ساتێک چاوەکانم لێک نا، مەلێک بەرەو درەختەکەی **ڕۆنی** فڕی و لە سەر ئەو لقە نیشتەوە کە دوایین هەڵووژەکەی پێوە بوو. بە دندووکی وەرگەڕایە هەڵووژەکە، هەڵووژەکە کەوت.
بە پێی گوزارشتی خەونەکەم بێ، **ڕۆنی** ئیتر ناگەڕێتەوە. بەربوونەوەی دوا هەڵووژە، دێتە ئەو واتایەی کە **ڕۆنی** مردووە؛ دایکم بەم جۆرە خەونەکانی من لێک دەداتەوە.
بەڵام بەیانیی ڕۆژی دواتر **ڕۆنی** گەڕایەوە.
**ڕۆنی** بە پێستێکی خۆڵەمێشی و خاکی گەڕایەوە، قژی درێژ ببوو و ڕدێنی هاتبوو. برۆکانی، خودای من! تووکی دەست و قاچەکانی خۆڵەمێشی هەڵگەڕابوون. سەرباری ئەو هەوا ساردە چاکەتی لەبەر نەکردبوو، کراسێکی قۆڵ کورت و شۆرتێکی پۆشیبوو.
ئەمە **ڕۆنی** نەبوو. خەیاڵم درۆی لەگەڵ نەکردبووم، **ڕۆنی** چیتر نەیدەتوانی بگەڕێتەوە. ئەمە کەسێکی تر بوو، پیاوێکی هۆڵەندی نەبوو؛ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا

کەسێک کە دەبووە بەشێک لە ماڵی مە، پیاوێکی خۆڵەمێشی کە دەبووە بەشێک لەم ماڵە، کەسایەتییەک کە لە چیرۆکێک لە چیرۆکەکانی مێشکمدا هاتبووە دەرێ، کابرایەک کە لە هەقایەتێکەوە هاتبوو، پیاوێکی سەر بە ئەفسانەیەکی کۆنی فارسی. نەخێر، ئەمە **ڕۆنی** نەبوو، **دەجال** بوو.

"**حەکیمی فیردەوسی** دەگێڕێتەوە، **دەجال** لە ڕەنگی خۆڵ بوو. هەر لە تافی منداڵییەوە، هەر لە هەرەتی لەدایکبوونەوە خۆڵەمێشی ڕەنگ بوو. کوڕی پاشایەکی فارس بوو و ئامانج ئەوە بوو ببێتە جێنشینی باوکی. بەڵام لە نەگبەتیان، خۆڵەمێشی ڕەنگ بوو.

پاشا هاواری کرد: 'ئەم منداڵە لە من نییە، بێ سەروشوێنی کەن!'

نۆکەری پاشا بێ سەروشوێنی کرد. بەڵام نا، منداڵەکەی لە کۆڵ کرد و بە چیایەکی بەرزدا سەرکەوت. کە گەیشتە لوتکە، منداڵەکەی لە سەر تاوێرێک دانا، بە چارەنووسی خۆی سپارد و بە خەم و پەژارەوە بەرەو کۆشک شۆڕ بووەوە.

لەپڕدا سیمورغ، مەلی ئەفسانەیی، بە شەقەی باڵ دەرکەوت. بە پەنجە بەهێزەکانی مناڵە خۆڵەمێشییەکەی هەڵگرت و بردیە نێو هێلانەکەی و لە پاڵ جووجەڵەکانی دانا."

"سڵاو **ڕۆنی**! ئاخری گەڕایتەوە؟"

سەیری نەکردم. بە پێوە ڕاوەستابوو، پیاوێکی خۆڵەمێشی و دەتگوت بووەتە بەرد، ڕووی لە دەرگەکە بوو.

"ئەو هەمووە لە کوێ بووی؟"

وەڵامی نەدایەوە.

"**ڕۆنی**، دەنگم نابیستی؟"

کلیلێکی بە دەستەوە بوو و هەوڵی دەدا دەرگەکە بکاتەوە، بەڵام نەیدەتوانی، کلیل نەدەچووە نێو کێلوونەکەوە.

"زۆر دواتر، ساڵانێکی زۆر دواتر **دەجال** گەڕایەوە ماڵی خۆیان. سیمورغ، مەلە ئەفسانەییەکە، کلیلێکی دایە دەستی و بەرەو کۆشکی پاشا وە دوای خۆی دا.

سیمورغ گوتی: 'گەیشتین! جا دەرگەکە بکەرەوە!'

بەڵام **دەجال** دەرگەکەی بۆ نەدەکرایەوە، نەیدەتوانی بە دەستەکانی کلیلەکە لە نێو کێلوونەکەدا بسووڕێنێ.

سیمورغەکە هاواری کرد: 'ماڵەکەی خۆتە! دیسان هەوڵ بدە!'

**دەجال** تەوێڵی بە دەرگەی کۆشکەکەوە نا و بە لاڵەپەتی گوتی: 'ناتوانم.'"

گوتم: "دەتەوێ بێم یارمەتیت بدەم **ڕۆنی**؟ کلیلەکەم پێ بدە!"

بە سیمایەکی ون کلیلەکەی بۆ ڕاداشتم. هەوڵم دا دەرگەکە بکەمەوە، بەڵام بێ سوود بوو. کلیلەکە ژەنگی گرتبوو، چینێکی ئەستوور لە ژەنگ دەمەکەی داپۆشیبوو.

"ئەم کلیلە بەکار نایە. کلیلێکی دیکەت پێ نییە؟"

سەیری کردم، چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسک.

گیرفانەکانی شۆرتەکەی گەڕام، بەتاڵ بوون.

"خولەکێک ڕاوەستە **ڕۆنی**! ئێستا دێمەوە"، وام گوت و بە سەر پەرژینەکەدا بازم دا بۆ ئەوەی بچمە گەنجینەکەی خۆمان. دەمویست ژەنگی دەمی کلیلەکە بسڕمەوە. لە نێو وردەواڵەکاندا بە دوای لەتە سمارتەیەکدا دەگەڕام، کە گوێم لە دەنگی شکانی پەنجەرەیەک بوو. بە پڕتاو ڕام کردە دەرەوە، **ڕۆنی** بوو؛ بە مشت شووشەی دەرگەکەی شکاندبوو و بە دەستوپلی خوێناوییەوە دەیویست بەو کوونەدا بچێتە ژووری.

"ڕاوەستە! خولەکێک ڕاوەستە! ئەوە چیت کردووە؟!"

لە چاوترووکانێکدا خۆم گەیاندێ، بە هەموو هێز ڕام گرت و بردمە دواوە. بەڵام کاردانەوەکانی چاوەڕواننەکراو بوون، یەک بە خۆی پاڵی پێوە نام و بەرەو دەرگەکە ڕای کردەوە.

من پڕ بە گەرووم هاوارم کرد: "یارمەتی! تکایە یارمەتی!"

جیرانەکان بینیبوویان کە سەرباری ئەو هەوا تووش و دژوارە، **ڕۆنی** جلی هاوینەی پۆشیوە. دەیانزانی دەبێ شتێک ڕوو بدا، دراوسێکان لە پشت پەردەکان چاوەڕێ بوون من داوای یارمەتی بکەم. لەناکاو پیاو، ژن، کوڕ و کچی گەڕەکەکەمان ڕژانە نێو باخچەکەی **ڕۆنی**وە. سێ پیاو بەرەو **ڕۆنی** غاریان دا، توند گرتیان و بەرەو باخچەکە ڕایان کێشا. بەم جۆرە شان و دەست و

قاچیان گرت و بردیانه سەر چیمەنەکە. **ڕۆنی**، لە کاتێکدا خوێن لە دەستەکانی دەچۆڕا، سەیری منی کرد. من، **بولفەزل**، جیرانەکەی، کە واقی وڕمابوو.

ژنێک بە تەلەفۆنەوە نزیکم بووەوە.

- چ قەوماوە؟

- کلیل، کلیلەکە!

- مەبەستتان لە کلیل چییە؟ ئەم کلیلە چ واتایەک دەگەیەنێ؟

لەو ساتەوەختەدا چیتر نەمدەتوانی بە هۆڵەندی قسە بکەم، وشەکان خۆیان لە یادەوەریم دەدزییەوە. هەوڵم دەدا زمانم بێتە گۆ و گوتم: "کلیلەکە، ژەنگ، دەمە ژەنگاوییەکەی!"

ژنەکە لێم تێنەگەیشت، شایەتحاڵێک بووم کە وشەکان خیانەتیان لێ دەکردم. لە سەر ئەرزەکە بە دوای کلیلەکەدا وێڵ بووم، لە بن پێی یەکێک لە ژنانی جیران بوو، هەڵم گرتەوە و پیشانی ژنەکانم دا.

"سەیری کەن! ئەو ژەنگە. دەیبینن... بە کەڵک نایە. ناتوانی بیسووڕێنی... لە نێو... نێو... هێنە... کێلوونەکەدا!"

دەنگی ئاژیر لە نێو گەڕەکەکەدا بەرز بووەوە. ئۆتۆمبێلێکی پۆلیس لە بن دەرگەکە ڕای گرت، سێ پۆلیس چوونە باخچەکە و بە پەلە خۆیان گەیاندە **ڕۆنی**. یەکێک لەوان لە پشتڕا کەلەپچەی لە دەستەکانی **ڕۆنی**

دا، دوو پۆلیسـەکەی تـر یارمەتییـان دا و پێکەوە تـا کن ئۆتۆمبێلەکە ڕایان کێشا، منداڵ بەدوویان کەوتبوون.
یەکێـک لە پۆلیسـەکان گەڕایەوە و ڕووی کـردە مـن و لێی پرسیم:
- تۆ لە سەرەتاوە لێرە بووی؟
- بەڵێ، لێرە بووم.
- دەتوانی بە وردی پێم بڵێی چ ڕووی دا؟
ئەو ژنەی تەلەفۆنەکەی پێ بوو، گوتی: "باش بە زمـانی ئێمە قسە ناکا"، بەڵام پۆلیسەکە سەرنجی پێ نەدا.
"قسە بکە! بۆمان بگێڕەوە! بە ئـارامی بۆمـان بـاس بکە لە سەرەتاوە چ قەوماوە."
دەستم بەرەو پۆلیسەکە ڕاداشت و کلیلەکەی نێو لەپی دەستمم پێ پیشان دا.

## ٩

پۆلیسەکان ڕۆنیی‌یان لەگەڵ خۆیاندا برد، بەڵام من نەمدەزانی دەچنە کوێ.

بەیانیی ڕۆژی دواتر، پیاوێکی کۆڵانەکەمان بە تەختەدارێک، چەکوچێک و کۆمەڵێک بزمار هاتە نێو باخچەکەی ڕۆنی و ئەو دەرگەیەی گرت کە شووشەکەی شکابوو.

لە پیاوەکەم پرسی: "کاکە زەحمەت نەبێ، ئەرێ پۆلیس ڕۆنیی‌یان بۆ کوێ برد؟"

گوتی:

- نازانم. ڕەنگە بردبێتیان بۆ نەخۆشخانەیەکی تایبەت بە نەخۆشییە دەروونییەکان.

- ئاخۆ بەم زوانە دەگەڕێتەوە؟

- نازانم، بەڵام پێم وابێ نا، نەخێر، وێناچێ زوو بگەڕێتەوە.

چ پاش ماوەیەک بگەڕێتەوە و چ نا، ئێستا ماڵەکەی داخراوە.

ماڵەکەی ڕۆنی خاڵی پەیوەندیی نێوان ئێمە و جیرانەکانی ترمان بوو. کە ڕۆنی لێرە بوو، ماڵەکەی

ئــێمەش بەشــێک بــوو لە ماڵەکــانی تــر، ئێســـتا کە دەرگەکەی قەپـات بـووە ئەم ڕایەڵەش ون بـووە. **ڕۆنـیَ** مرواریـی ملـوانکەیەک بـوو و هەڵوەشـایەوە. ئـێمە ئێتـر جیرانی کەس نەبووین و پێگەی کۆمەڵایەتیمـان گـۆڕانی بەسـەردا هـاتبوو؛ ئـێمە "ئەو کەسـە بێگانـانە بـووین کە دیوار بە دیواری ماڵێکی چۆڵ دەژیاین."

بە شێوەیەکی کاتی ئەم مۆرەم پەژراند کە لێم درابوو، وەکوتر نەمدەتوانی هـیچ بکەم. بەڵام بۆ ئەوەی خـۆمی لـیَ قوتـار بکەم، لێرەولەویَ ملـم وە بەر کـاری وەرزانە نا. نەمدەویست چیتر هیچ نەبـم، ئەم چێژە تـاڵە لە سـەر زارم مـــابووەوە. دوو ســـاڵ وەک پەنـــابەر لە **تورکیـــا** ژیـابووم، چیتـر نەمدەویسـت خـۆم لە دۆخێکـی وەهـادا بدۆزمەوە. لە **هۆڵەندا** سەرلەنویَ دەمویست ببمەوە بەو کەسەی کە لە نیشـتمانی خـۆم بـووم، بگـرە دەمخواسـت لە دۆخێکـی باشـتردا بـم. بیـرم دەکـردەوە: **ڕۆنـیَ** بـۆی هەیە ڕۆیشــتبیَ، لــیَ مــن لێــرەم. بــۆی هەیە چیتــر لەم مـاڵەدا نەژی، بەڵام مـن لەو مـاڵەدا دەمێـنمەوە کە دیـوار بە دیواری ماڵە داخراوەکە هەڵکەوتووە.

بـۆی هەبـوو جیرانەکـان پێیـان وابـیَ مـن پەنـابەرێکی داماوم، بەڵام من چیتر پەنابەر نەبـووم. دەکرا **ڕۆنـیَ** بە چۆکدا هاتبیَ، بەڵام من نا، من بە پێوە وەستاوبووم.

هاوکــات بیــرم لەوە دەکــردەوە کە مــن شـــایەتحاڵێکم، شایەتحاڵێک کە دەیویست تا دوایی ڕابکا. بەڵام من هیچ

هەوڵێکم نەدا بۆ ئەوەی پەی بەو شتە ببەم کە بەسەر **ڕۆنی** دەهات.

ئەوەی ڕاستی بێ دەترسام، دەترسام لەوەی دەرگەی ژووری نەخۆشخانەیەکی دەروونی بکەمەوە و لەناکاو ببینم **ڕۆنی** بە قەرەوێڵەکەیەوە بەستراوەتەوە.

"سڵاو، **ڕۆنی**!"

ئەویش نیگایەکی مردووی تێ بڕیبام و وەڵامی نەدابایەوە.

جاران من بەردەوام زراوم لە نەخۆشخانەی نەخۆشییە دەروونییەکان دەچوو. ئێستا لە **هۆڵەندا** سامی ئەوەم ڕێ نیشتبوو، خۆم لە یەکێک لەو ژوورانەدا بدۆزمەوە و وەک بێگانەیەک لە گۆشەیەکی تاریک، بە کۆتێکی بەستراو بە کۆزینگی پێمەوە بە چارەنووسی خۆم بسپێردرێم.

زۆرم حەز دەکرد **ڕۆنی** ببینم، بەڵام **ڕۆنی**یەکی ڕووخاو نا. پێم خۆش بوو **ڕۆنی** بگەڕێتەوە، بەڵام لە سەر پێ بگەڕێتەوە.

هەندێک ئێوارە کە شەوەزەنگ باڵی بە سەر وڵاتدا دەکێشا، تاسەیم دەکرد. نەخاسمە ئەو شەوانەی وا باران دای دەکرد. بیرم دەکردەوە باسەکە **ڕۆنی** نییە، بەڵکو باسەکە بۆشایی بەجێماوی ئەو کەسەیە وا دەڕوا. بۆشایی و شەوانی ئێران، ئەو ساتەوەختەی خۆر بە هێمنی لە پشت چیا بەرزەکەوە ئاوا دەبوو و

کورپژگەیەکی حەوت ساڵانە لە دایکی دەپرسی: "دایە، بۆچی باوکم ئیتر ناگەڕێتەوە؟"

زستانێکی فرە تووش بوو و پیاوان بێکار دانیشتبوون، ئەوەندە بێکار مابوونەوە کە چیتر نەیاندەتوانی بە دەستی بەتاڵ بگەڕێنەوە. ماڵ و حاڵیان بەجێ دەهێشت تاکو کارێک بدۆزنەوە. ئەمە بەسەر باوکیشم هاتبوو، ڕۆیشت و چەند مانگ بزر بوو و هیچ هەواڵێکمان لێ نەزانی. ماڵەکەی ئێمە دەیڕوانییە چیاکان، لە پشت ئەو چیایانەش گوندی بچکۆلەبچکۆلە هەبوون، چووبوو لەو گوندانە فەرشی کۆن نووژەن بکاتەوە. هەموو پیاوەکان دەمێک بوو گەڕابوونەوە، بەڵام ئەو نا.

کەس هیچی نەدەزانی، کەس نەیبینیبوو. ڕەنگە هەوایەکی زۆر سارد و سڕ لە نێو جەرگەی چیاکاندا خافڵاندبێتی، ڕەنگە گەلەگورگی برسی گەمارۆیان دابێ، لەوانەیە لە کوێرەدێیەک مابێتەوە و چاوەڕێ بێ چینی بەفر بتوێتەوە و ڕێگەکان سەرلەنوێ بکرێنەوە. هەموو ئێوارەیەک دایکم کورسییەکی لە پەنا دەرگە دادەنا و منیش لە کنی دادەنیشتم، سەیری چیاکانمان دەکرد و هیوادار بووین ڕۆژێک لە نێو تاریکیدا دەربکەوێ.

- دایکە، پێم بڵێ، باوکم ڕۆژێک لە ڕۆژان دەگەڕێتەوە یان قەت نایەتەوە؟

- دەگەڕێتەوە کوڕم، بەڵام سەرەتا با چاوەڕێ بین بەفر بتوێتەوە. ئەوسا بێگومان چاومان پێی دەکەوێتەوە.

دواجار بایەکی گەرم هەڵی کرد، گەڵای زەردی لق و پۆپەکانی دارهەڵووژەکە هێدیهێدی وەرینە سەر بەفرەکە. بێ سەبرانە چاوەڕێ بووم ئێوارە دابێ و لە پڕێکدا **ڕۆنی** پەیدای بوو.

هاواری کرد: "سڵاو، **بولفەزل**!"

گەڕابووەوە، بە تاقی تەنیا گەڕابووەوە، بە ڕوخسارێکی ئاسایی و دوو چاوی گەش، کە تێیاندا هەست بە بوونی ڕۆحی دەکرا.

دوو کورسی و مێزێکی بچووکم لە سەر چیمەنە نەرمەکە دانا، بوتڵێک و دوو پەرداخم هێنا، سەری شووشەکەی هەڵپچڕی و پەرداخەکانی داگرت.

گوتم: "بە خۆشیت!"

خێزانم لە پەنجەرەی نهۆمی خوارەوەڕا پرسی:

- ئەوە لەو باخچەیە چ باسە؟

- وەرە پێکێکمان لەگەڵ بخۆوە، **ڕۆنی** گەڕاوەتەوە.

بە مۆمێک بە دەستییەوە لەولاڕا هات، مۆمێک کە ئاگرەکەی بە بای بەهاری وە سەما کەوتبوو.

"بە خۆشیتان!"

**ڕۆنی** گەڕابووەوە، ئەو هەمدیس لە ماڵەکەی دەژیا؛ تەنیا، بەڵام لەگەڵ وێنە و بیرەوەرییەکانیدا.

کاتێک بە تەنیایی لە سەر مێزەکە نانی دەخوارد، بەردەوام سەیری وێنەکانی دیوارەکەی دەکرد.

- ئێ **ڕۆنی**، برسی نەبووی؟

- دانیشە **بولفەزل**، هەندێک خواردن بۆ خۆت داگرە ئەگەر دڵت بۆی دەچێ.

پشتم دەکردە وێنەی سمتە ڕووت و تووکنەکان و بە پێوە پارووییەکم دەخوارد.

**ڕۆنێ** جارجارە چێشتی لێ دەنا و جارجارەش نا، هەندێک جار پڕی تاوەیەک سپاگێتی لێ دەنا و پاشماوەکەی بۆ ڕۆژانی تر هەڵدەگرت. لە هۆڵی ڕۆنیشتندا گلۆپەکان تا درەنگانی شەو دایسان. جاری وا هەڵدەکەوت لە شووشەکەڕا لە ژوورەوەم دەڕوانی، دەمبینی وەک هەمیشە لە پشت مێزە دارینەکەی دانیشتووە و بوتڵێکی لە پێشە و جگەرە دەکێشێ.

کەڕەتێک، شەو درەنگ، بینیم لە نێوەڕاستی ژوورەکە بە شێوەیەکی سەیر ڕاوەستاوە. چوومە پێشێ، سێ پایەیەکی نیگارکێشیی دانابوو و کپ ڕامابوو، لە بەردەم پارچەیەکی سپی و فڵچە بە دەست چاوەڕوان ڕاوەستابوو.

گوتم: "نەمدەزانی نیگارکێشی دەکەی."

**ڕۆنێ** وەڵامی دایەوە:

- پێشتر نیگارکێش بووم، بگرە پەیکەرسازیش. بەڵام لەناکاو بە لامەوە ئەستەم بوو دەست بۆ کارێک ببەم، دەبوایە بە نێوەچڵی وازی لێ بێنم. بیرۆکەکانم خۆیان لێ دەدزیمەوە. هەوڵم دا بەردەوام بم، بەڵام هەوڵێکی بێهوودە بوو. نائومێدانە هەرچی کەلوپەلی نیگارکێشی کە هەمبوو، کۆم کردنەوە و لە گەنجینەم پەستاوتن.

ئێستا دەمەوێ دیسان تێ هەڵبچمەوە، بەڵام دیسان بێسوودە. بیرۆکەکانم لە چنگم هەڵدێن، خۆیان دەدزنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا جارجارە بیرۆکەیەک هەڵدەتۆقی، بەڵام هەر کە دەمەوێ دەست بە کارەکەم بکەم، دەستبەجێ بیرۆکەکە لە بەر یەک هەڵدەوەشێتەوە. بۆیە بە فڵچەکەی دەستم وەک ئێستا، لە بەردەم پارچەکەدا چاوەڕێ دەمێنمەوە.

- چاوەڕێ؟ چاوەڕێی چی؟

- چاوەڕێی بیرۆکەکە. دەڵێم بەشکم یادەوەرییەکانم بە هانامەوە بێن و بیرۆکەکە بگەڕێتەوە.

- ئەی ئەگەر نەگەڕایەوە؟

ئەم پرسیارە زیادی بوو، دەمزانی یادەوەرییەکانی خیانەتی لێ دەکەن. ئەگەر سیحری هونەر بەجێت بێڵێ، جگە لە مەودایەکی بەتاڵ هیچی ترت بۆ نامێنێتەوە؛ وەک هێلانەی پەلەوەرێک کە سەری خۆی هەڵگرتبێ.

وەک کەسێک کە لە مەنفا دەژیم، بە شێوەیەکی سەرسوورهێنەر شتەکان پێکەوە گرێ دەدەم، یان باشتر وایە بڵێم لە ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان ڕووداوەکان دەگەڕێم. خاڵی مایەی تێڕامان ئەوەیە ئا لێرەدا یادەوەریم بە هانامەوە دێ، یادەوەریم یەکسەر لە نێو ڕابردوومدا لە وێنەیەک دەگەڕێ. ئەودەم، ئەوە چیرۆکی **قاسمی هەقایەتخوان** بوو ختووکەی مێشکی دام.

ئەوەی ڕاستی بێ ئیتر بەو شێوەیە متمانەم بە یادەوەرییەکانم نییە، گشت ئەم چیرۆکانە بۆ خۆم هەڵدەبەستم. دەترسم، بۆیە وا دەکەم. لەوە دەترسم یادەوەریم شەرمنانە خۆی بدزێتەوە. دەکەومە خۆ، ئەم جۆرە چیرۆکانە بە شێوەیەکی خۆڕسکانە دادەهێنم. پێشم وایە ئەوە چارەنووسی کەسێکی دوورخراوەیە کە یادەوەری ڕۆژ بە ڕۆژ پتر خیانەتی لێ بکا. بەڵام چ پەنام بۆ یادەوەرییەکانم بردبا و چ نا، چیرۆکی **قاسمی هەقایەتخوان** لەو ساتەوەختەدا بە مێشکم دەگەیشت. ئەمە بەسەرهاتی پیاوێکە کە سەری پەیمانشکێنیی کرد، لە کاتێکدا زۆر پێویستی پێی بوو. بەردەوام دەچووە سەر سەکۆیەک و خەڵک بە کۆمەڵ غاریان دەدا تاکو گوێ لە قسە سیحراوییەکانی بگرن.

ئێوارەیەک کە دەیویست بێتە گۆ و ئاپۆرای خەڵکانی دێ ئابڵوقەیان دابوو، لە نێوەڕاستی بەسەرهاتەکەیدا تێ گیرا.

**قاسم** ئیتر نەیدەتوانی وشەیەک چییە بێنێتە سەر زمان، نەیدەزانی ساتێک لەوە پێش باسی چیی کردبوو. تۆزێک ڕاوەستا، لە فکرەوە چوو، بەڵام بێ سوود بوو، بەسەرهاتەکە جێی هێشتبوو. جەماوەر بە بێدەنگی چاویان تێ بڕیبوو؛ هەوڵی دەدا شتێک بڵێ، چیرۆکێک بگێڕێتەوە، بەڵام لە نێو یادەوەرییەکانیدا تەنانەت نەیدەتوانی وشەیەکیش بدۆزێتەوە. ڕۆح و ئەو سیحرەی هەرتم بە هانایەوە دەهات، لەناکاو

بێسەروشوێن ببوو. چیتر هێزی ئەوەی تێدا نەمابۆوە چیرۆکێک بهۆنێتەوە، مێشکی کتوپڕ بەتاڵ ببوو.

لە سەر سەکۆکە هاتە خوارێ، خەڵک پێیان گوت: "خەمت نەبێ، سبەی ئێوارە دێینەوە گوێت لێ دەگرین. ماندووی، بە دڵنیاییەوە دوێنێ شەو باش نەخەوتووی."

بەڵام خەڵکی دێ بۆیان دەرکەوت کە چاکبوونەوەی بۆ نییە.

ئێوارەی ڕۆژی دواتر دانیشتووانی گوند بە تاسووقەوە لە مەیدانەکە کۆ بوونەوە، **قاسم** چووە سەر سەکۆکە و دەستی کرد بە گێڕانەوەی یەکێک لە چیرۆکە کۆنەکانی. خەڵک هەناسەیان لە سینگدا قەتیس هێشتبووەوە و گوێیان بۆ ڕاداشتبوو. چیرۆکەکەیان بیستبوو، بەڵام لە خۆیان دەپرسی پاشان بڵێی چ ڕوو بدا. لەناکاو هەقایەتخوان هەمدیس بێدەنگ بووەوە، ئەم برینە چارەی نەبوو. پیاوماقووڵێکی گوند گوتی: "بەتاڵە، مێشکی جێی هێشتووە."

خەڵکی گوند دڵیان دایەوە: "ئەرخەیان بە **قاسمی هەقایەتخوان**، هیچ گەڵایەک بێ ویستی خودا لە دارێک ناوەرێ. بڕۆ بخەوە، ڕەنگە وشەکان لە خەودا بگەڕێنەوە لات."

گۆچانەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت. شەوێک بە سەر ڕووبارێکی قووڵی نامۆدا کەوت: "دەزانی ڕووبارەکە، من سەرێکی بەتاڵم هەیە و هیچی تر. با دێتە ناوی و

گڤه دەکا. سەرم دێشێ. سەرم پڕ بکە، بۆ ئەوەی با نەتوانێ بێتە ناوی."

هەتا نێوەڕاستی ڕووبارەکە ڕۆیشت، دەستەکانی لێک کردنەوە و ڕاکشا. شەپۆلەکان هاتن و لەگەڵ خۆیاندا بردیان، بۆ ئەوەی چیتر با نەیگاتێ.

ئێستا کە چیرۆکی **قاسمی هەقایەتخوان** لە بیرکردنەوەکانمدا شێوەی گرتووە، لە ژووری ڕۆنیشتنی **ڕۆنی**دا زۆر شتی تر لە کەلوپەلەکانیم بۆ دەرکەوتووە. پەیکەرەکان، تا ئەو ساتە من سەرنجم نەدابوون. کۆمەڵێک پەیکەر بوون کە دەتتوانی لە سەر ئەرز و لە هۆڵی ڕۆنیشتنیان دابنێی. **ڕۆنی** بە قسڵێکی سپی سازی کردبوون و لە پشت کەلوپەلەکانی دیکە حەشار درابوون. هیچ کام لەم پەیکەرانە تەواو نەکرابوون، هەر کامە و شتێکی کەم بوو. گشتیان لە نیوەی ڕێدا بە چارەنووسی خۆیان سپێردرابوون؛ پیاوێک لە پشت قەنەفەکە خۆی شاردبووەوە، ڕوخساری نەبوو، بەڵام تاجە پەمەییەکەی بان سەری بواری ئەوەی پێ دەدای هەست بکەی کێ بووە. ئەسپێک نیوەی لە پشت ئاوێنەیەک حەشار درابوو حاڵەتێکی سەیری هەبوو، کە دەتبینی بە خۆت دەگوت: "ئەسپەکە ئێستا نا ئێستا غار دەدا." بەڵام هاوکات بۆچوونەکەت دەگۆڕی و لە دڵی خۆتدا دەگوت: "نا، نایەوێ چیتر ڕابکا، لە بیری چووەتەوە دەیەوێ چ بکا."

مەلێک لە لێواری هێلانەکەی لە فڕیندا بوو و نەتدەزانی داخوا هێلانەکەی جێ دەهێڵێ یان بۆی دەگەڕێتەوە.

تەنانەت ئیتر وێنەکانیش لە نێو مندا جۆرێک گومانیان دروست کردبوو: "ئاخۆ ئەو مەمکانەی لە وێنەکاندا دەبینران هیی **میەترا** بوون؟"

گەلێک جار ویستبووم چیرۆکێ **قاسمی هەقایەتخوان** بۆ **ڕۆنی** بگێڕمەوە، بەڵام بۆم نەدەگێڕایەوە.

بێدەنگبوون، خەسڵەتێکی تایبەت بە پەنابەران.

پەنابەرێک بێدەنگ دەبێ، چونکە دەزانێ جارجارە ڕووداوەکان بەو جۆرە ڕەوتی خۆیان ناگرنە بەر کە چاوەڕوان دەکرا. بەگشتی دڕدۆنگە و پێی باشترە پرسیار بکا. پرسیارگەلی ئاسایی نا، بەڵکو هیی چاوەڕواننەکراو.

"**ڕۆنی**، دەزانی مەلە بکەی؟"

بە سەرسوورمانەوە پرسی:

- مەلە؟ مەبەست لە مەلەکردن چییە؟
- مەلەکردن. مەبەستم مەلەکردنە.

پرسیارێکی هەڕەمەکی نەبوو، ئامانجێکی دیاریکراوی هەبوو. بە ڕاستی سەبارەت بە **ڕۆنی** پەژارە دایگرتم، دەترسام نەکا نەزانێ مەلە بکا.

ئەو تێنەدەگەیشت بۆچی پرسیارێکی لەم شێوەیەی لێ دەکەم، بەڵام من دەبوایە وەلامەکەیم زانیبا. خەیاڵەکانم بەردەوام دەیانویست **ڕۆنی** لە **ئەیسێل**دا بخنکێ.

من نەمدەویست تەنانەت تا **ئەیسێل**ی بەرم، بەڵام ئەوە خەیاڵ و بیرکردنەوەکانم بوون وایان دەویست.
**ڕۆنی** جەرگەی شەو بە پارێزەوە لە ماڵ دەردەکەوت، بەرەو بەنداوەکە دەڕۆیشت، لە نێو تاریکیدا لەگەڵ **ئەیسێل** دەدوا. پاشان دەچووە نێو ئاوەکەوە، دەستەکانی لێک دەکردەوە و ڕادەکشا. ئەوسا شەپۆلەکان دەیانبرد بۆ ئەوەی سەری لە با بەتاڵ بکەن.
- **ڕۆنی**، دەزانی یان نا؟
- چی دەزانم یان نا؟
- دەزانی مەلە بکەی؟
- نا، باش نازانم، بەڵام بەڕەی خۆمی پێ لە ئاو دەردەکێشم.
به خۆمم گوت جێگەی خۆشحاڵییە و هەناسەیەکی ئاسوودەم هەڵکێشا، دەتوانێ بەڕەی خۆی لە ئاو دەرکێشێ.
وێنەکەم پێچەوانە کردەوە، شەپۆلەکان **ڕۆنی**یان فڕێ دەدایە کەنارەوە. **ڕۆنی** بە دڕدۆنگییەوە بە هەورازی کەنارەکەدا سەردەکەوت و بە ئاراستەی مەزراکاندا ڕێگەی دەگرتە بەر.

## ١٠

ئـاخۆ پەیوەنـدی و هـاوڕێیەتیم لەگەڵ **ڕۆنـیَ** پـاش گەڕانەوەی گۆڕدرابـوو؟ دیـارە گومـانی تێـدا نەبـوو گەڕاوەتەوە، بەڵام لە لایەکی دیکەوە ئەو نەگەڕابووەوە. مەبەست چییە؟ چۆن دەتوانم وشەیەکی هۆڵەندی پڕ بە پێست بدۆزمەوە و بتوانم مەبەستی خۆم بگەیەنم؟

هەڵبژاردەیەکی ئەوتۆم لە بەردەمدا نییە، دوو ڕستەی پێک ناکۆک دەخەمە بەرامبەری یەکترییەوە:

"**ڕۆنیَ** گەڕاوەتەوە." "**ڕۆنیَ** نەگەڕاوەتەوە."

دەمبینـــی لە ژووری دانیشـــتن خەریـــکە جـــگەرە دەپێچێتەوە، بەڵام هاوکات خۆی لەویَ نەبوو.

دەمبینی خەریکی چێشتلێنانە، بەڵام ئەوە **ڕۆنـیَ** نەبوو. **ڕۆنیَ** بە جۆرێکی تر هەڵسوکەوتی دەکرد؛ جاران کە لە نانـدێنەکە دەمبینـی، بـیَ یەک و دوو دەمزانـی کە ئەمە **ڕۆنـیَ**یە، بەڵام ئێستا بە تـالووکەم. قەرەوێڵەکەی هەروا لە بن پەنجەرەکە بوو، بەڵام ئەو بە دانیشتنەوە لە سەر مێزەکە خەو دەیبردەوە.

لـێم دەپرسـی: "**ڕۆنـیَ**، وەختـی ئەوە نەهـاتووە بچـی بخەوی؟"

کاتژمێر نزیکەی دووی بەرەبەیانی بوو، لەوە دەترسام جگەرەکەی فڕێ بداتە سەر موکێتەکەی و ئاگر لە ماڵەکەی بەر بدا.

جگەرەکەیم لە تەپڵەکەکەدا دەکوژاندەوە و دەمبردە سەر قەرەوێڵەکەی.

لە ڕاستیدا **ڕۆنی** نەگەڕابووەوە، دەمزانی نەگەڕاوەتەوە. ناندێنەکە دەیزانی نەگەڕاوەتەوە، ژووری ڕۆنیشتن هەروا. ئەو کورسییەی ئەو لە سەری دادەنیشت هەستی بەمە دەکرد، بگرە قەرەوێڵەکەی دانی بە بزربوونی **ڕۆنی**دا نابوو، دەیزانی. ئەو باخچەیەی ئەو وازی لێ هێنابوو، لەمێژ بوو هەستی پێ کردبوو. بەڵام خودی **ڕۆنی** هێشتا نەیزانیبوو.

ماوەیەکی پێ دەچێ تا مرۆڤ بڕوا بکا ماڵەکەی خۆی جێ هێشتووە، هەموو شتێ بەرەبەرە ڕوو دەدا. دیارە ماوەیەکی دوورودرێژ بوو **ڕۆنی** ڕۆیشتبوو. دەمزانی کە **ڕۆنی**ش شاربەدەر بووە، بەڵام نەمدەتوانی بزانم ڕێک کەنگێ دەرکراوە.

ئاخۆ لەو ساتەدا بووە کە ژنەکەی وازی لێ هێناوە؟ تۆ بڵێی لەو کاتەدا ڕووی دابێ کە زەماوەندی کردووە؟

نەخێر. پێم وایە زەماوەندی کردبوو بۆ ئەوەی لە دەرکران ڕزگاری بێ، لەبەر ئەوەی ئەوەی پیاوێکی ئاسایی نەبوو. بۆ ڕاونانی گومانەکانی لە سەر ئەو مەیلەی بەرەو پیاوەکان پاڵی پێوە دەنا.

کەواتە دەبێ ئەمە زۆر زووتر ڕووی دابێ.
ڕەنگە لە تافی گەنجێتیدا.
یان کتومت لە ساتەوەختی لەدایکبوونیدا، هاتنەدونیا هەمان و ڕاونانی هەمان.
چۆن دەکرێ بزانی؟ نەخاسمە لەم دۆخە تایبەتەدا کە هیچ زانیارییەکم دەربارەی نەبوو. من تەنیا **میەترام** دەناسی، ئەویش **ڕۆنیـ**ی بەجێ هێشتبوو. من **مۆکا مۆکا**شم دەناسی. ڕۆژێک **مۆکا مۆکا** هەوڵی دا **ڕۆنی**ی ڕووت لە پشتەوەڕا ڕابگرێ، بەڵام تەنانەت ئەوەش هیچ سوودێکی نەبوو.
منیش نەمدەتوانی هیچ شتێکی بۆ بکەم. دەمویست کەمێک دڵی بدەمەوە، بەڵام دەمزانی دڵدانەوەکانم هیچ شتێک ناگۆڕن. بە چ ئامانجێک نزیکی **ڕۆنی** دەبوومەوە؟ بۆچی کاتژمێر دووی بەرەبەیان چوومە ژوورەکەی؟
من؟ پێم نایە ژوورەکەی بۆ ئەوەی هەموو شتێک ببینم، تاکو بزانم ڕووداوەکان بە کام ئاڕاستەدا گەشە دەکەن، تاکو پەی بەوە بەرم کە شاربەدەرکرانی ڕووداوەکان ڕواڵەتێکی چۆن بە خۆوە دەگرن. ئەی کە بە جارێک پشتت لە ئەرز کەوت، چیت لێ دەقەومێ؟
شەو چوومە ماڵەکەیان بۆ ئەوەی دواتر پێی بڵێم: "**ڕۆنی** ناتوانێ گەڕابێتەوە. **ڕۆنی** مافی ئەوەی نەبوو بگەڕێتەوە."

زەنگی کاتژمێر بۆ کێ لێی دابێ، ئەو کەسە دەبێ یەکسەر ملی سەفەر بگرێت. هەر کەسێکیش سەفەری کرد دەبێ هەتا دوایی بڕوا، تا ئەو خاڵەی کە چیتر ناتوانێ بڕواتە پێش، لەو شوێنەی وا دەکەوێ.
هەموو شتەکان یەک بە خۆ جاڕی ئەوەیان دەدا کە **ڕۆنێ** دەبێ ئەم ماڵە جێ بێڵێ.
سەربان بۆ هەموو لایەک ڕای دەکرد، بۆری ئاوی لێ دەچۆڕا و بە هیچ جۆرێ ڕانەدەوەستا، گڵۆپی ژوورەکەی چیتر نەیدەویست ڕووناکی بە **ڕۆنێ** ببەخشێ و تاریک و نووتەک داهاتبوو.
مەکینەی قاوە چەقی بەستبوو.
خودی من، چیتر پرسیارم ئاڕاستە نەدەکرد.
دواجار **ڕۆنێ** هاتە نێو باخچەکەوە، لە تاریکیدا بانگی کردم: "**بولفەزل!**" ئەو شەوە دەرەوە سارد بوو، هێشتا وەرزی بەفر و بەستەڵەک نەهاتبوو، بەڵام بە خۆمم دەگوت ئەمشەو کارێزەکە دەیبەستێ.
**ڕۆنێ** دیسان بانگی کردمەوە: "**بولفەزل!**"
لە ژووری میوانان دانیشتبووم، بەڵام وەڵامم نەدەدایەوە. دەمزانی ئەم دەنگە گریاناوییە چ واتایەک دەگەیەنێ. لەبەر دڵڕەقییان نەبوو، بەڵام حەزم دەکرد جارێکی دیکە گوێم لێ بێتەوە تاکو باش لە یادەوەریمدا تۆماری بکەم.
**ڕۆنێ** بۆ سێیەم جار بە دەنگێکی کز و لەرزۆک گازی کردم: "**بولفەزل!**" وەڵامم دایەوە: "چ بووە **ڕۆنێ**؟"

گوتی: "دەمەوێ ماڵەکەم بگوازمەوە."

بە پێی نەریتەکانی نیشتمانەکەم دەبوایە بەرەو ڕوونی چووبام، لە ئامێزم گرتبا و بەختێکی باشم بۆ ئەم پاژە نوێیەی ژیانی بۆ بە ئاوات خواستبا، بەڵام وام نەکرد. دەستم درێژ کرد و دەستە ساردەکەیم گووشی.

بە لامەوە سەخت و دژوار بوو، بەڵام دەمزانی چارەیەکی دیکەی نییە.

جانتاکەی هەڵگرت و ڕۆیشت.

لە نێو تاریکیدا وەستام و بە نیگا شۆپاندم. سەرەتا بە درێژایی کارێزەکەدا ڕۆیشت، پاشان بە سەر پردە دارینەکەدا تێپەڕی. ئیتر هیچ هەڵبژاردەیەکی تری نەبوو، دەبوایە ملی باریکەڕێیەکانی قەراغ مەزراکان بگرێت بۆ ئەوەی بگاتە بەنداو. تا ئەو کاتەی گەیشتە داوێنی کەنارەکە توانیم ببینم، پاشان دارەکان گرتیانە خۆ.

## ١١

کەنگێ ڕووی دا؟ هەفتەیەک دواتر؟ دوو هەفتە دواتر؟ چ گرنگییەکی هەیە. لەناکاو دەستەیەک کوڕی لاو، خەڵکی کۆڵانەکە، لە نێو باخچەکەی ڕۆنیدا هەڵتۆقین، لە نێو تاریکیدا. بە دارەکەدا هەڵڕووسکان بۆ ئەوەی هەڵووژەکان لێ بکەنەوە، ئەو دوا هەڵووژانەی لە سەرمادا ڕەش دەهاتنە بەر چاو. کوڕەکان قەپاڵێکیان لە هەڵووژەکان دەدا و دەستبەجێ فڕێیان دەدان، هەڵووەژەکان ئیتر شیاوی خواردن نەبوون. کرم لێی دابوون، دارەکە نەخۆش کەوتبوو.

پاشان کوڕەکان بەرەو پەنجەرەکە چوون، تەوێڵ و دەستەکانیان بە پەنجەرەکەوە نا و هەوڵیان دا بزانن چ لە ناوەوە هەیە. ژوورەکە چۆڵ بوو. کوڕەکان دەیانزانی چۆڵە، بەلام من نا. ڕۆنی بە تەنیا جانتایەکەوە ڕۆیشتبوو. ئەی کەلوپەلەکان چۆن لابرابوون بێ ئەوەی من ئاگام لێی بێ؟ کێ گشت ئەم شتانەی گواستبووەوە، ئەو قەرەوێلەیە، ئەو وێنانە، ئەو پەیکەرانە، مێزە دارینەکە و ئاوینەکەی بەر هەیوان؟ پێلی گۆڕانکارییەکان بەردەوام درەنگ سەرنجیان

ڕادەکێشام، بەردەوام زۆر درەنگ. دەبوایە کوڕەکان بە دارەکەدا هەڵبڕووسکێن تاکو بۆم دەربکەوێ کە قەرەوێڵەکە و ئاوێنەکە نەماونەتەوە.

بۆ شۆپاندنی ڕەوتی ڕووداوەکان، چووم لە گۆشەی عەمبارەکە خۆم مات دا. ژووری ڕۆنیشتم تاریک بوو، بەڵام کوڕەکان دەیانزانی بە دووی چدا وێڵن. بێگومان شتێکی سەرنجڕاکێش لەم ئاڵۆزییەدا هەبوو، شتێک کە تەنیا ئەم گەنجانە دەیانتوانی ببینن. سەرەتا هەوڵیان دا پەنجەرەکە بکەنەوە، بەڵام نەیانتوانی. بە بەن و شتی وا، ئەو باوەشێنەیان دەرهێنا کە لە نێو پەنجەرەکەدا جێگیر کرابوو. پاشان هەوڵیان دا بەو کونەدا بخزێنە ژوورەوە، بەڵام ئەمەشیان بۆ نەچووە سەر. ماوەیەکی زۆر لە پەنجەرەکەوە سەیری ناوەوەیان کرد، لە پڕێکدا یەکێک لەوان دەرگەکەی پیشان دا و هاواری کرد: "ئەو تەختەیە!"

ئەو تەختەیەی جیرانەکە بۆ گرتنی دەرگەکە بەکاری هێنابوو، پاش ئەوەی ڕۆنی خۆی شووشەکەی شکاندبوو. کوڕەکان بە دەست تەختەکەیان لێ کردەوە و یەک بە دوای یەک چوونە ژوورەوە.

لێرەوە بەدوا نەمتوانی ببینم چ دەکەن. ماوەیەکی زۆری پێ نەچوو، دەم بە پێکەنین وەک شێتان، بە پەلەپەل یەکە یەکە لە شووشە شکاوەکەوە هاتنە دەرێ.

ئەو شتەیان دۆزیبووەوە کە لێی دەگەڕان، لە نێو ئەنگوستەچاوی کۆلاندا ڕایاندەکرد و لە خۆشیان دەیانقیژاند. چییان لەگەڵ خۆیان بردبوو؟

بەیانیی ڕۆژی دواتر، کێڕێکی دەستکردی گەورە لە گەڕەکەکەمان کەوتبوو. بێگومان من یەکەمین ڕێبوار بووم چاوم پێی کەوتبوو.

کازیوەی بەیانی بوو، تەم و مژ ماڵەکانی دەورپێچ کردبوو، بۆیە زەحمەت بوو لە دوورەوە شتەکان لێک هەڵاوێری. لەگەڵ ئەوەشدا من لە سەر ئەرزەکە بینیم، گەورە و تەڕ بوو، تەمومژ چەند دڵۆپێکیان لە سەر جێ هێشتبوو. سەیری دەوروبەری خۆمم کرد، کەس بەدی نەدەکرا. بە نووکی پێڵاوەکانم پاڵم پێوە نا، هەندێک جووڵایەوە وەک ئەوەی کێڕێکی ڕاستەقینە بێ. لە نێو تەمومژدا گوێم لە دەنگی کەسێک بوو و بە شەقێک کێڕەکەم فڕێ دایە بن ئۆتۆمبێلێکەوە.

سەعاتێک دواتر، خۆر گەڕەکەکەی ڕووناک کردەوە، تەمومژ شوێنەواری نەمابوو. بەوپەڕی سەرسوورمانەوە بینیم کە ئەم کەرەستەیە نەک لە بن ئۆتۆمبێلەکە، بەڵکو لە پەنا ماڵەکەی ئێمەیە. چیتر دڵۆپەکانی پێوە نەمابوو.

جیرانەکان بە سواری پاسکیل و بە تریقەتریق بە دەوروبەریدا دەهاتن و دەچوون و لە پەنجەرەکانڕا سەیری منیان دەکرد، کە لە سەر مێزێک دانیشتبووم و کتێبێکم دەخوێندەوە.

پەردەکانم دادایەوە. حیلکەحیلکی ژنان تا پاش نیوەڕۆ بەردەوام بوو، تا ئەو ساتەوەختەی کوڕەکان لە دواناوەندی گەڕانەوە، ئەوجا نۆرەی ئەوان بوو. بە درێژایی پاشنیوەڕۆ بەو کێرە پلاستیکە تۆپ تۆپێنیان کرد. ڕێک تا ئەو کاتەی ئێوارە داهات، ئینجا لە نێو کۆلانەکە وازیان لێ هێنا و بە غاردان ڕۆیشتنەوە ماڵەکانیان.

پەردەکانم لا دا.

کەس نەیدەیویست هەڵی بگرێتەوە، کەس نەیدەویست بیخاتە نێو زبڵدانەکەیەوە. بە خۆمم گوت: "بەلام من هەڵی دەگرمەوە، بەڵێ، لێ ئێستا نا؛ ئەمشەو، کە ژنانی گەڕەکەکەمان خەوتن."

بێگومان دەبوایە کەسێک هەڵی بگرێتەوە.

بیرم کردەوە هەڵی دەگرمەوە و دەیخەمە نێو نایلۆنێکەوە، نێو نایلۆنێکی ڕەش و فڕێی دەدەمە نێو تەنەکەی زبڵەکەمانەوە.

چوومە سەر سفرەی نانخواردن. دەمویست سەرەتا لەم بارەوە لەگەڵ ژنەکەمدا قسە بکەم، بەلام ئەم بابەتە هیچ پەیوەندییەکی بە ئێمەوە نەبوو. شتێک بوو کە پەیوەندیی بە هۆڵەندییەکانەوە هەبوو.

کەمێک قاوەیی بوو. چ بەو ڕەنگە دەڵێن؟ وەک پێستێکی ڕەنگ تۆخ، نا، بەو شێوەیە تۆخ نا، بەلام هەرچی بێ سپی نەبوو.

ئەم کەرەستەیە خاڵێکی هاوبەشی لەگەڵ مندا هەبوو، لەگەڵ ڕەنگی پێستمدا. تەنیا ئێستا بە ڕاستی گوێم لە حیلکەحیلکی ژنانی سەر پاسکیلەکان دەبوو.

چ پێم خۆش بوایە و چ نا، ئەم دەعبا زلە پەیوەندیی بە منەوە هەبوو و دەبوایە وە خۆ کەوتبام.

سەیری خێزانەکەمم کرد، متەقی لێوە نەدەهات، کوڕەکەشمان بێدەنگ بوو.

بە خێزانەکەمم گوت: "من نەمدەزانی. ئاخۆ تۆ دەتزانی ڕۆنی کەلوپەلەکانی بردووە یان نا؟"

نەیدەویست چاو لە چاوم ببڕێ، هەروەها نەیدەویست قسەم لەگەڵ بکا. بێدەنگییەکی سامناک زاڵ ببوو.

گوتم: "من تەنیا دوێنێ هەستم پێ کرد، کتوپڕ بینیم کوڕگەل بە سەر دارەکەدا هەڵڕووسکان، هەڵووژەکانیان لێ کردەوە و فڕێیان دان. پاشان تەختەکەیان لێ کردەوە و وە ژوور کەوتن."

فزەی لێوە نەهات. ئەوەی ڕاستی بێ ئێمە وێکمان هەڵنەدەکرد، لەم بارەوە لەگەڵ هیچ کەس قسەمان نەدەکرد. تەنانەت کوڕەکەشمان بێ ئاگا بوو، بەڵام بەردەوام قڕە و کێشەمان هەبوو. ئەگەر دەمەقاڵەشمان کردبا، نەدەبوایە کەس پێ بزانێ. کلتوورەکەمان وای دەویست، ئەوە ڕازی ماڵەوە بوو.

لە وڵاتی خۆمان دەمەتەقەی ئەوتۆ لە نێوانمان ڕووی نەدەدا، بەڵام لێرە هەموو شتێک کاکڵی خۆی لەدەست داوە.

له وڵاتی خۆشمان زۆر پێکەوە هەڵمان نەدەکرد، بەڵام هاوسەرەکەم خۆی کۆنتڕۆڵ دەکرد، تا هەندێک سنوور دەڕۆیشتە پێش، پاشان دەوەستا، دەستی دەکرد بە گریان و شتەکە زۆر قوول نەدەبووەوە. کەچی لێرە نەیدەتوانی بێدەنگ بێ، زاری لێک دەکردەوە و هەرچی پێی خۆش بوایە دەیگوت، منیش نەمدەتوانی بەسەر ڕق و تووڕەیی خۆمدا زاڵ بم.

گوتم: "ئەی کۆرسەکانت چۆنن؟ توانیت بێ گرفت لەگەڵیاندا بچیتە پێشەوە؟ مەبەستم ئەوەیە لێیان ڕازیت؟"

وەڵامی نەدامەوە، نەیدەویست بە هیچ شێوەیەک قسە بکا.

لەپڕدا شتیک تەقەی لە پەنجەرەکە هێنا، شتێک کەوتە نێو باخچەکەی بەردەمماڵەوە.

دەمزانی چییە، ویستم بە پەلە خۆم بگەیەنمە پشت پەنجەرەکە. دەتتوانی شوێنەواری چڵکنیی دەعباکە لە سەر شووشەی پەنجەرەکە ببینی.

هاوسەرەکەم هاواری کرد:

- ئەوە چ بوو؟

- پشیلە بوو. پێم وابێ پشیلەی ئەم ژنەیە...

گەڕامەوە بۆ سەر سفرە.

بیرم کردەوە سەرەتا پێویستە نایلۆنێکی ڕەش بدۆزمەوە.

شەو بە ئەسپایی دەرگەی دەرەوەم کردەوە، بە پێدزە لە باخچەکەدا هەنگاوم بەرز دەکردەوە. کێرە دەستکردە تەڕەکەم بە شووڵکێک خستە نێو نایلۆنە ڕەشەکەوە، قورس بوو؛ بێگومان هێندەی مشکێکی مردووی نێو نایلۆنێکی ڕەش.

دەبێ کێشی دەعباکەی **ئەسفەرە کەچەڵ** چەند بووبێ؟

بە دڵنیاییەوە گەورە بوو، لەوەدا گومانم نییە. جارێکیان دۆخینی شەڵوارەکەی کردەوە و کێرە زلەکەی دەرهێنا.

گوتی: "هەر کەس دەستی پێدا بێنێ، دەتوانێ جارێک بە خۆڕایی سواری ئەم پاسکیلە نوێیە ببێ."

پاسکیلێکی کوڕانەی سوور و تازە لە سەر سەکۆی بەردەم دووکانەکە دانرابوو و لە ژێر تیرێژی خۆردا بریقەی دەهات، کوڕیژگەکان درِدۆنگانە دەیانڕوانییە کێری **ئەسفەرە کەچەڵ** و پاسکیلەکە.

دایکم هەموو ساڵێ دەیگوت: "ئەگەر ڕیزی نمرەکانی ئەمساڵی خوێندنگەت باش بن، پاسکیلێکت بۆ دەکڕین."

بەڵام هەرگیز نەبوومە خاوەنی ئەو پاسکیلەی بەڵێنیان پێ دەدام.

بۆ ئەوەی مناڵەکان خەونەکانیان نەبەنە ژێر گڵ، **ئەسفەرە کەچەڵ** لە سووچێک چاوەڕێ دەبوو. چەند پارەیەکی ئاسنمان پێ دەدا و بۆ دە خولەک پاسکیلمان بە کرێ دەگرت. ئەگەر پارەمان پێ نەبوایە کێشە نەبوو، هەموو شتێکی چارەسەر کردبوو؛ لەگەڵ خۆیدا دەیبردییە نێو کەلوپەلەکانی کۆتایی دووکانەکەی، کە

تاریــک بــوو. ئەمە زۆری نەدەخایانــد. ئینجــا خــۆت دەتتـوانی بە دڵـی خـۆت پاسـکیلێک هەڵببژێـری و پێـنج خولەک لێی بخوڕی.

دووکانەکەی **ئەسغەر** بۆ من شوێنێکی قەدەغە بوو.

باوکم دەیگوت:

- ئەگەر دەتەوێ فێری پاسکیلئاژۆتن بی، ئەوەی ماڵێ بەکـار بێنە. ئەگەر تەنیـا جارێک لە بەردەم دوکـانەکەی **ئەسـغەرە کەچەڵ** بتبینم، دەتکوژم. تێگەیشـتی چیم پێ گوتی؟

- بەڵێ باوکە. بەسەرچاو.

بە ڕاســتی پــێم وا بــوو بــاوکم دەمکــوژێ ئەگەر لە دەوروبەری ئەم پیاوە چاوی پێم بکەوێ، دەشـمزانی بۆ پیاوانی ماڵەکەمان شەرمێکی گەورە دەبێ ئەگەر بێت و **ئەسغەر** دەست بە سمت و کەفەڵم دابێنێ.

## ١٢

**ئەیسێل**؛ کاتی ئەوە هاتبوو دەورێک بە پاسکیل لێ بدەم.

تاریکی باڵی بەسەر وڵاتدا کێشابوو. سەگەکانی مەزراکان دەوەڕین کە بە پەنایاندا تێپەڕ دەبووی، تا سنووری دیاریکراو ڕەپێیان دەنای، پاشان دەگەڕانەوە کولانەکانیان.

بەم جۆرە سەگەکان بەشی ئارامی **ئەیسێل**یان دەپاراست. بە تێپەڕبوونی من سەگەکان نەوەڕین.

سەیرە! لە کەیەوە ئیتر ناوەڕن؟ ڕەنگە لەو کاتەوە کە من ماوەیەک لە مەزراکانیان کارم کرد.

کە گەیشتمە دوایین مەزرا سەگێک بە کلکەسووتە بەرەو پیرم هات، سەگی ئەو مەزرایە بوو کە کۆگا زبڵەکەم بۆ فڕێ دابوون. سەگەکە پێی وا بوو دەچم سەرێک لە خاوەنەکەی دەدەم، بەڵام بە پێچەوانەوە، دەستێکم بۆ ڕاوەشاند و درێژەم بە پاسکیلئاژۆتن دا و مەزراکەم لە پشت سەر بەجێ هێشت. ساتێک وەڕی و بەدوومدا ڕای کرد، توندتر پێدالم لێ دا بۆ ئەوەی وە

پێشی کەوم، بەڵام ئەو نەیدەویست هیچ بزانێ، بازی گەورەگەورەی دەدا و شان بە شانی من دەهات.

پاسکیلەکەم ڕاگرت.

هاوارم کرد: "بڕۆ! دەورێک بە پاسکیل لێ دەدەم. بگەڕێوە بۆ لای خاوەنەکەت!"

گوێچکەکانی قووت کردبوونەوە و سەیری منی دەکرد. کە ویستم بڕۆم خۆی ئامادە کرد تاکو دوام بکەوێ، نیوەدەورێکم لێ دا بۆ ئەوەی بیبەمەوە مەزراکەی، لێرەدا دەستی بە وەڕین کرد. وەرزێرەکە لە تەویلە هاتبووە دەر و وەک هەمیشە جگەرەیەکی بەرگی گەورەی بە لێوەوە بوو.

- سڵاو **بولفەزل**! چی تۆی هێناوەتە ئێرە؟

- ئەو سەگە. دەمویست بەرەو بەنداو بچم، بەنیاز بوو لەگەڵم بێ.

وەرزێرەکە گوتی: "دەبینم ئێستا باشتر قسە دەکەی."

وەڵامم نەدایەوە.

بە دەنگێکی باوکانە پرسی: "کاروبارەکان باش دەچنە پێش **بولفەزل**؟"

کتوپڕ چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسک، هەرچەند من کەسێکی هێندە دڵناسک نەبووم. نەمدەزانی بۆ چارەنووسی خۆم دەگریم یان بۆ هیی **ڕۆنی**. ویستم شتێک بڵێم، شتێک بگێڕمەوە، بەڵام نا، هیچم نەگوت. نیوەدەورێکم لێ دایەوە و بەرەو قەراغ ڕووبارەکە ڕۆیشتم. بە درێژایی ڕێگە چەند بوتڵێکی بەتاڵ لە نێو

گژوگیادا فڕێ درابوون، بە خۆمم گوت لە سەفەردان.
هەر کە یەکێک لەم بوتڵانە دەبینم خەیاڵی سەفەر ختووکەی مێشکم دەدا؛ دیمەنێک کە لە ماڵی باوەگەورەم لە هزرمدا شێوەی گرتووە.
"باوەگەورە! سەفەری بوتڵە بەتاڵەکان چ مانایەک دەگەیەنێ؟"
دایەگەورەم هەڵی دەدایە: "گوێ لە قسە و هەقایەتی باوەگەورەت مەگرە! ئەقڵی لەدەست داوە."
باوەگەورە شەپقەکەی لا دەبرد و ڕواڵەتێکی کەمێک ونی بەخۆوە دەگرت، زەردەیەک لە سەر لێوەکانی دەنیشت.
دایەگەورەم بەردەوام دەبوو: "کۆگایەک بوتڵە بەتاڵن. ژێرزەمینێکی پڕ لە بوتڵی بەتاڵ. ڕقم لەم بوتڵانە دەبێتەوە."
بەردەوام دەیگوت: "ئەم مێردەم سەرشۆڕی کردووم، زیاتر لە نەوەد ساڵی تەمەنە و بۆ جارێک چییە ڕووی نەکردۆتە مەککە."
هیچ وێ نەدەچوو بە خۆیدا شکابێتەوە، پیاوێکی گەورە و گران بوو، نەخاسمە بەو شەپقەیەی وا لە سەری دەکرد و ئەو گۆچانەی بەردەوام بە دەستییەوە بوو. پیرەمێردێکی کەڵەگەت بوو و کلیلێکی کۆن و ژێرزەمینێکی تەژی لە بوتڵی بەتاڵی هەبوون، ئەو بوتڵانەی پێشتر پڕ بوون.

دایەگەورە و باوەگەورەم لە گوندێکی داوێنی چیا دەژیان، ماڵەکەیان کۆن بوو و لە سەر زنارێک چێ کرابوو. باب و کاڵی من بە درێژایی چەندین سەدە لەم ماڵەدا ژیابوون. لە بن ماڵەکەدا، لە بن زنارەکە، کونێکی گەورە هەبوو، زارکە بەردێک. دیوارێک لەوێ هەڵچنرابوو، دەرگەیەکی تێ خرابوو و گەنجینەیەکی لێ دروست کرابوو.

ڕۆژێک باوەگەورەم پێی گوتم: "وەرە، کاتی ئەوە هاتووە ئەو عەمبارەت پێ پیشان بدەم."

دەوروبەری دوانزە ساڵم تەمەن بوو. بە چەند پلیکانەیەکدا کە لە بەرد داتاشرابوون چووینە خوارێ، کلیلێکی کۆنی لە گیرفانی دەرهێنا و لە نێو کێلوونەکەدا بای دا، پێمان نایە نێو عەمبارەکەوە. کە هێندەی تەندوورێک تەنگ و تاریک بوو، نە ڕووناکاییەک بەدی دەکرا و نە گڵۆپێک.

"ئەم ژێرزەمینە دەبێ هەمیشە بەم جۆرە بمێنێتەوە، وەک سەردەمی باوکم و باوکی باوکم."

دوو تەختەی کردەوە، تیشکۆڵەکانی خۆر وە ژوور کەوتن. سەرەتا نەمدەتوانی هیچ ببینم، پاشان لەناکاو بوتڵە بەتاڵەکان لە نێو ڕووناکیدا بەدەر کەوتن. بوتڵە بەتاڵەکان لە سەر ڕەفەی بەردین ڕیز کرابوون، بە درێژایی چەندین سەدە. چینێک تۆزی ئەستووریان لە سەر نیشتبوو.

"ئەم بوتڵانە چین؟"

باوەگەورە گوتی:
- ئەمانە کردەوە و نهێنییەکانی پیاوانی ئەم ماڵە دەگێڕنەوە، کە ئیتر نەماون. منیش بوتڵەکانی خۆمم لێرە داناوە. زۆری پێناچێ منیش دەبێ بە نۆرەی خۆم ئەم ماڵە جێ بێڵم.
- جێی بێڵی؟ مەبەستت چییە باوەگەورە؟
- وەرە پێشەوە! سەیری ئەم بوتڵانە بکە! ئەمانە هیی یەکەمین دانیشتوانی ئەم ماڵەن.
لە گۆشەیەکی تاریک و نوتەک، چەندین بوتڵ لە تەنیشت یەک ڕیز کرابوون. نەمدەتوانی لێکیان هەڵاوێرم، بەڵام بە ڕواڵەتیانرا دەمتوانی هەست بەوە بکەم کە زۆر زۆر کۆنن.
باوەگەورە بەو پەڕی پارێزەوە یەکێک لەو بوتڵانەی هەڵگرت، نووسینێکی بچووکی پێوە نووسابوو.
"سەیر کە... ئەمەیان هیی **حەسەن** کوڕی **حەسەن** کوڕی **حەسەنە**... بە بۆنەی... خوراوەتەوە... سەیری کە... وشەکان چیتر ناخوێنرێنەوە، با بوتڵێکی دیکە هەڵگرین."
بوتڵێکی دیکەی لە ژێر ڕووناکیدا بەرز کردەوە، بەروارێکی ساڵنامەی فارسی بە سەرەوە بوو. ١٠٩٤ - نزیکەی سێسەد ساڵ لەمەوپێش.
- ئەمەیان هیی... **هادی** کوڕی **حەسەن** کوڕی **حەسەنە**. بە بۆنەی... بە بۆنەی کوشتنی باوک

خوراوەتەوە. بڕوانە... چەقۆیەک لە نێو... لە نێو پشتی، پێم وابێ.

- چەقۆ؟

- بەڵێ، چەقۆ.

بوتڵەکەی لە جێی خۆی دانایەوە و بوتڵێکی دیکەی بە هەڵکەوت لە سەر ڕەفەکە هەڵگرت.

"ئەمەیان ساڵی ١١١٣، لەگەڵ **خاتوو** میـ خوراوەتەوە. حەح! چ گەمەزانەیە! دەبوایە ناوی تەواوی ژنەکەی نووسیبا. دەبێ ئەم ژنە کێ بووبێ؟ ناوێک کە بە میـ دەست پێ دەکا. جا وەرە هەڵیدە! **میرا... میرجام... میتا... مینووشا** یان **میەترا**؟"

ئەو بوتڵەشی لە جێی خۆی دانایەوە و بوتڵێکی تری هەڵگرت.

"ساڵی ١٢١٤ لە غەریبی خوراوەتەوە. **تەقی** کوڕی **هادی** کوڕی **بولفەزل**."

"ساڵی ١٢٩٠، **محەمەد** کوڕی **بولفەزل** کوڕی **حەسەن**. بە بۆنەی... گرتنی... ناخوێنرێتەوە. مێژووی ئەم بنەماڵەیە بە چەقۆ، گرتن، هەڵاتن و خۆشەویستی نووسراوەتەوە."

"١٣٤٠، بە بۆنەی... ئەو شەوە تاڵانەی تەژی بوون لە مەیلی و. ئاخ! خودای گەورە، سەیری ئەو هەموو پەیوەندییە قەدەغەیەی نێو ئەم ماڵە بکە! ئێستا کەمێک لە ڕقی دایەگەورەت تێدەگەی؟"

هەر وا بە چاوگێڕان بە گژوگیای دەوروبەردا درێژەم بە پاسکیلئاژۆتن دا، پێم وا بوو دەبێ بوتڵی دیکەش هەبن. بە ئاڕاستەی ڕۆژهەڵاتدا بە قەراغ ڕووبارەکەدا پێدالّم لێ دا و چاوەڕێ بووم ببینم **ئەیسێل** باوەشێک بوتڵ لەگەڵ خۆیدا دەبا؛ بوتڵە بەتاڵەکانی باوەگەورە. بەڵام ئەگەر **ئەیسێل** نەتوانێ، ئەوا **عاشوورا** دەتوانێ.

هەر چۆمە و خەسڵی تایبەت بە خۆی هەیە، **عاشوورا** باوەشباوەش بوتڵە بەتاڵەکانی باوەگەورەی دەگواستەوە.

ئێوارەیەکی پاییزی، ڕۆیشتە ژێرزەمین و دوایین بوتڵی لە سەر ڕەفەکە دانا. پاشان دەرگەکەی بە کلیل کڵۆم دا و ویستی بێتەوە ژووری. "خولەکێک، پێویستە نەختێک دابنیشم." لە سەر یەکەم پلیکانەی ژێرزەمینەکە دانیشت، چاوەکانی نووقاند و مرد.

دایەگەورە یەکەم کەس بوو پێی زانی. سەرەتا لە گیرفانی مێردەکەیدا بە دووی کلیلەکەدا گەڕا و گازی کرد: "یارمەتیم دەن! **حەسەن کوڕی بولفەزل** مرد!"

شەو دایەگەورە ساکێکی دەست دایە و بە پێدزە خۆی بە ژێرزەمیندا کرد. دایەگەورە بینرابوو کە ویستبووی بە نهێنی بەرەو چۆمی **عاشوورا** بخووشێ، لە کاتێکدا ساکێکی گەورەی بە کۆڵەوە بوو. ساکەکەی لە نێو چۆمەکەدا بەتاڵ کردبوو و هاواری کردبوو: "**عاشوورا!** ئەو بوتڵانە بەرە بۆ ئەو شوێنەی وا پێت خۆشە."

به دێهاتێکـــدا تێـــپەڕ بـــووم کە پیرەدرەختێـــک لە نێوەڕاستییەوە قووت ببووەوە، پاشان خێرا بەرەو لای ڕاســـت بــام دایەوە و بە پردێکـــی گەورەی ئاســـنیندا دەرباز بووم کە دەیگەیاندمە ئەوبەری تری ڕووبارەکە. بە دوای کڵێســـەکەدا یەکەیەکە بە گوندەکانـــدا تێـــپەڕ دەبـووم، دەمویســت بـزانم چـۆن منـارەی کڵێســەکەی بەردەوام دەکەوتە ســـەرووی بەنـــداوەکە و لە نێـــو تاریکیدا لە پەنجەرەوە لە ژوورەکەمانی دەڕوانی.

تاریکان داهاتبوو کە دۆزیمەوە، کڵێسـەیەکی کۆن بوو کە کپ و ئارام لە تەنیشت چەند درەختێکی کەسک و بەرز هەڵکەوتبـوو. لە پاســکیلەکەم هــاتمە خــوارێ و ویســـتم بچــمە نێــو کڵێســـەکەوە، بەڵام دەرگەکەی بە قفڵێکـــی گەورە و زنجیرێـــک داخرابـــوو. بە درێژایـــی ڕووبـــارەکەدا هەڵکشـــامەوە. لەوبەری تـــر، لەودیـــو مەزراکـــان و لە دوورەوە، ڕوونـــاکی لە پەنـــجەرەی ژوورەکەمـــانەوە دەدرەوشـــایەوە. مـــاڵەکەی جیرانمـــان تاریک بوو.

## ١٣

وادەی بەفـر و کرێـوە بـوو، لە نیشـتمانی منـیش وەک **هۆڵەنـدا** بەفـر دەبـاری. بەفـر مـاوەیەکی زۆر لە سـەر کەڵەبـابەکەی **ڕۆنـیّ** مـایەوە، هەروەهـا لە  سـەر لـق و پۆپەکانی درەختەکە.

لە خۆم دەپرسی، تۆ بڵێی ئەم درەختە وەرزی زسـتان بژیّ؟ کە سەیرت دەکرد، بە خۆت دەگوت: "ئەم درەختە ڕەق هەڵـگەڕاوە، هیچـی پێـوە نەمـاوە، درەختێکـی سەرمابردوو و مردووە."

بیـرم لەوە دەکـردەوە کە شـنەبای بەهـاری هەڵی کـرد، ئەم درەختە چیتر ناژێتەوە، چیتر گەڵا و چرۆ ناکاتەوە، چیتـر هەڵـووژەی سـەوز و شـینی تـۆخی پێـوە نـابن. "ماڵئاوا خۆر، ماڵئاوا مەلەکان، منیش دەڕۆم."

درەخـتەکە بەرەبەرە لە نێـو خەیاڵەکانمـدا شـوێن بـزر بوو. چیتر نەمدەتوانی لە ماڵیّ بمێنمەوە، زاتـم نەدەکرد. بە خۆمم دەگوت، ئەگەر کارێکم دۆزیباوە خۆم بە شتی نوێـوە سـەرقاڵ دەکـرد و بەم جـۆرە لەگەڵ ڕابـردووم مەودام دەگـــرت. بەڵام کـــاری وەرزی بە ڕاســـتی کورتخـایەن بـوون، پـاش چەنـد ڕۆژ یـاخود هەفـتەیەک

دەبــــوو گەڕابـــــامەوە مـــــاڵێ. جیرانەکـــــان بە بەردەم پەنجەرەکەماندا تێپەڕ دەبوون، دەیانبینی کە هێشتا وا لە مـاڵم. هەسـتم دەکـرد سـەربازێکی نەخۆشـم، بیـرم دەکردەوە کە هەمـوو هۆڵەندییەکان چوونەتە بەرەکانی جەنـگ و مــن بە تەنیـا لێـرە مــاوەمەتەوە و وازم لــێ هێنراوە. ساکێکی هەرزانبووم کڕی، کەلوپەلەکانم تێ خست و خزامە کتێبخانەوە.

دوو سێ هەفتە دواتر، کارێکی بچووکی درێژخایەنم لە کـارگەیەکی خـواردنی قوتـوو دۆزییەوە. هەتـا کـاتژمێر دوو لەوێ کـــارم دەکـــرد، پاشــــان ڕاســـتەوخۆ ڕووم دەکـردە کتێبخـانە. لەوێ هەوڵـم دەدا تـا کـاتژمێر پێـنج بمێـنمەوە. کــاتژمێر پێنجــی ڕێــک، بە پاســکیل خــۆم دەگەیاندەوە ماڵێ. لە پشت دوایین چراکانی ترافیک، بە پاسکیلەکەمەوە خۆم لە نێو دەرودراوسێدا دەدۆزییەوە، خۆشیان بێ و ترشیان بێ، بەم جۆرە شان بە شانی یەک دەگەڕایـــنەوە گەڕەکەکەمـــان. کــــاتژمێر شـــەش هاوســـــەرەکەم پەردەکـــــانی تەواو لا دەدان، ئینجـــــا هەمووومـــــان دەچـــــووینە ســـــەر ســـــفرە و هەر وەک جیرانەکانمان خواردنێکی گەرممان دەخوارد.

چیتر هەواڵی ڕۆنیەم بە گوێ نەدەگەیشت، ڕەنگە ئاوا باشتر بێ. هۆڵەندییەک بوو و ڕۆیشتبوو، هۆڵەندییەک کە پاش ئەوەی دەوروبەری سێ ساڵ دیوار بە دیواری ئێمە ژیا، مـاڵەکەی گواستەوە. ڕۆنـێ چ گرنگییەکی بۆ مـن هەبـوو؟ چیتـر پێویسـتیم پێـی نەبـوو. ڕابـردووم چ

خێرێکی بۆ من هەبوو؟ ماڵی باوکم، باوەگەورەم و بوتڵە بەتاڵەکانی بە من چی؟ بژی کارە کاتییەکەم! بژی کتێبخانە!

بەڵام هێندەش سانا نەبوو؛ نە **ڕۆنی** و نە ڕابردووم نەیاندەهێشت ئاسوودە بم. بە ڕێی کتێبخانەوە بووم، ڕۆژێک کە کرێوەی دەکرد تووشم بە تووشی **ڕۆنی** هات. بە پێ دەڕۆیشتم و پاڵم بە پاسکیلەکەمەوە دەنا، لە نێو قەرەباڵغیی خەڵکدا ڕێی دەکرد، لێم ڕوانی. بەرەو لای من دەهات، بەڵام نەیبینیبووم. لە دونیایەکی تردا بوو.

گوتم: "هەلەو **ڕۆنی**!"

گوێی لە دەنگم نەبوو.

هەمدیس دووبارەم کردەوە: "سڵاو، **ڕۆنی**!"

نەخێر، کاردانەوەی پیشان نەدا. بێ ئۆقرەیی ڕوخساری شێواندبوو. دەمویست قۆڵی بگرم، ڕایوەشێنم، لەم خەواڵووبوونە دەریبێنم و بڵێم: "سڵاو، **ڕۆنی**!"

بەڵام هیچم نەکرد. کتوپڕ حەزم نەکرد چیتر قسەی لەگەڵ بکەم.

دەترسام، بەڵام لە چیی دەترسام، تا ئەو ساتە هێشتا نەمدەزانی.

لە نێو قەرەباڵغیی خەڵکدا خۆم شاردەوە و چوومە کتێبخانە. بۆ ئەوەی باش ببینم، بە پەلە خۆم گەیاندە نهۆمی یەکەم و ڕۆیشتمە پشت پەنجەرەوە. **ڕۆنی** بە

هێمنی ڕێگەی دەپێوا، سەیری هەنگاوەکانیم کرد؛ بە نەرمی دەنیشتنە سەر ئەرزەکە. دەتگوت دەیەوێ هەنگاوەکانی لە سەر ئەرزەکە ڕابگرێ، بەڵام جەستەی دەیەوێ باز بدا.

من خۆیشم لە نێو هەورەکان بووم؛ دوو قاچم لە سەر ئەرزە تەڕەکەی **هۆڵەندا** بوو، بەڵام مێشکم لە دونیای خەیاڵدا بوو، لە جیهانی ڕابردوومدا.

**ڕۆنی** لە نێو ئاپۆرای خەڵکەکەدا ون بوو و منیش بۆ هۆڵی خوێندنەوە شۆڕ بوومەوە.

هەروا کە بیرم لە **ڕۆنی** دەکردەوە، بەرەو یەکێک لە ڕەفەکان هەنگاوم نا.

سیمای بزربووی **ڕۆنی** ترساندبوومی، لەوە تۆقیبووم منیش ڕۆژێک لە نێو شاردا وێڵ و سەرگەردان ببم، وەک ئەو فەرامۆشکار ببم، بە بەردەم کتێبخانەی گشتیدا تێپەڕ ببم و بیرم نەیەتەوە چەندین ساڵم لە نێو ئەم کتێبخانەیەدا تێپەڕاندووە و سەرم خستووەتە نێو فەرهەنگە قەبەکەی **ڤان داڵ**ەوە.

لە نێو خۆمدا هاوارم کرد: "لە بەر چاوم ون بە ڕابردووم!"

بەڵام بێ ئەم بیرەوەرییانەی زێدی خۆم دەمتوانی چ بم؟ چۆن دەمتوانی لەم وڵاتە شێدارە بە دووی واتای وشەکاندا بگەڕێم، ئەگەر زۆپاکەی ماڵی باوکم لە نێو سەرمدا نێڵەی نەهاتبا!

"ئـادەی، ئەم زۆپـایەی ژووری میوانـان چ ڕەنگێکـی هەبوو؟"

"ئەو کچە گەنجەی جیرانمان کە وە ژوور کەوت، بۆنی چ عەترێکی لێوە دەهات؟"

کوڕێژگەیەکی تەمەن چواردە ساڵان بووم، لە تەنیشـت زۆپـاکە دانیشـتبووم و کتێبـێکم دەخوێنـدەوە. کتـوپڕ کچەکە لە کاتێکدا خۆی لە چارشـێوە درێژە ڕەشـەکەی وەرپێچـابوو، لە سـەربان بەدەر کەوت. بە دڵنیـاییەوە بە پلیکانەکاندا هاتبووە نێو حەوشەکەمان. مـن تەنیـا بووم، هـاتە ژووری. چارشـێوەکەی دانـا و لە پەنـای مـن، لە نزیک زۆپاکە دانیشت.

ئەمە لە مـاڵی ئـێمەدا شـتێکی ئاسـایی نەبـوو، پێشـتر هەرگیـز کچێکـی وەهـا گەنجـی غەریـبم ئەوەنـدە لە نزیکەوە نەبینیبوو. یەکەم دوگمە لەو حەوت دوگمەیەی لە سەر گەردنی دەچوونە خـوار، ترازابوو؛ مەمکەکانی وەک دوو کۆتر لە ژێر بلووزە تەنکەکەی دەجـووڵانەوە. زۆپـاکە قرچەقرچـی لێـوە دەهـات، بلـووزەکەی سـەر سینگی بە باران تەڕ ببوو. ئەوە یەکەم جار بوو لە سەر جەستەی کچێکی گەنج، بۆنی بارانم هەڵدەمشت.

هەمـوو جـارێ کە لەتەدارێکـم دەبینـی لە نێـو ئاگردانـدا گـڕ دەگـرێ، بـۆنی جەسـتەی ئەو کـچەم هەڵدەمشـت. هەمـوو جـارێ کە دڵۆپێـک بـاران دای دەکـردە سـەر بلـووزی ژنێـک، ئەم کـچە گەنـجە لە خەیاڵەکانمـدا دەبـووژایەوە. کە بینـیم ڕۆنـێ چیتـر ڕابـردووی خـۆی

نـایەتەوە بیـر و نـازانێ بـولفەزل کـێ بـووە، لە پڕێکـدا تێگەیشتم منیش چیتر توانام نییە بیرەوەریی ئەو بۆنە بژێنمەوە. تەنانەت ئەو ژنە هۆڵەندییانەی لە ژێر لێزمەی باران تـا سـەر ئێسـقان هەڵدەلەرزین، نەیانـدەتوانی ئەم بۆنە لە مندا زیندوو بکەنەوە.

شەوێک تەلەفۆنم بۆ ماڵی خۆمان لە وڵات کرد.

- ئەلۆ، دایە!

- ئەلۆ، کوڕم، چیت لێ قەوماوە؟ بۆچی دەنگت هێندە خەفەتاوییە؟

- دایە، گـوتم ڕەنـگە بـزانن... ئـاخۆ... دەی، دەیڵـێم... ئەرێ ئەو کچە گەنجە ناوی چ بوو؟

- کام کچی گەنج؟

- ئەو کـــچە گەنـــجەی کە بـــاران دای کردبـــوو هـــاتە سەربان.

- باسی چ دەکەی ڕۆڵە؟

- دەزانی... چۆن دەتـوانم بۆت بـاس بکەم، شـتێک لە مندا ڕوو دەدا و بیرەوەرییەکانی ڕابردووم دەسـڕێتەوە. ئادەی پێم بڵێ! ڕەنگی ئەو چادانە کۆنە چۆن بوو کە لە سووچێکی زۆپاکەمان دادەنا؟ سوور بوو، وا نییە؟

ئەوەنـدەی توانـام هەبـوایە خـۆڕاگریم دەکـرد، بەردەوام هەوڵـــم دەدا بیرەوەرییەکـــانم زینـــدوو ڕابگـــرم، تـــاکو بیرەوەرییەکـان بگەڕێـنمەوە بـۆ خـۆم، کە خەریـک بـوو بێسەروشوێن دەبوون. کاغەزە کۆنەکانم هەڵدەدایەوە، سـەیری وێنەکـانی جـارانم دەکـرد، نـاوی هاوڕێیـانی

پێشـوومم دەنووسـییەوە، هەروەهـا ژمارەکـان، ژمـارە ئاشناکان، ئەو ژمارانەی هەرگیز فەرامۆشیان ناکەین.
ڕۆژێک بە تەلەفۆن بە دایکمم گوت:
- ببوورە دایە...
- چ بووە کوڕم؟
- هیچ. ئەرێ ژمارەی دەرگەی ماڵی ئێمە چەند بوو؟
- ٩٤ ڕۆڵەم. بۆچی؟
- ئەها، منیش هەر بیرم بۆ ئەم ژمـارەیە دەچوو، بەڵام دڵنیا نەبووم ٤٩یە یان ٩٤.
بێ پسانەوە هەوڵ دەدەم وشـە هۆڵەندییەکان، شـیعری هۆڵەنـدی، شـیعرەکانی رووتـکەر **هێنـدریک ڤـان دەن هۆڤداککێر** ناوێک لە بەر بکەم، وەک مەرهەمێک دژ بە فەرامۆشی.
"دواجار جێهێشتنی مرۆڤەکان لێرە،
مێزەکە، ماڵەکە، نامیلکەکە،
بێ زیڤڕین؛
ئەم ئاسۆیە."
ئەمە هەندێک جار یارمەتیی دەدام، هەندێک جار نا.

## ١٤

ڕۆژی دواتر هەمدیس چاوم پێی کەوتەوە.

"هەلەو **ڕۆنی**! چۆنی؟"

سەرەتا نەیناسیمەوە، پڕم دایە دەستی.

"منم، **بولفەزل**، نامناسیتەوە؟"

زەردەیەکی تاڵ لە سەر لێوەکانی نیشت.

- بۆچی، **بولفەزل**.

- کە ڕۆیشتی بۆ ناونیشانی خۆت جێ نەهێشت؟

بە ئەسپایی پرسی:

- ناونیشانی خۆم جێ نەهێشت؟

- نا، لەناکاو بۆم دەرکەوت ماڵەکەت چۆڵە.

ناونیشانە نوێیەکەیم یادداشت کرد. لە بەر لێوەوە هەندێک شتی گوت، کە لێی تێنەگەیشتم. هەستم کرد لێم دەپرسێ، ئاخۆ حەز دەکەم سەردانێکی بکەم.

"بە دڵنیاییەوە، پێم خۆشە، ئەم ڕۆژانە سەرێکت لێ دەدەم."

دوو سێ هەفتە ناونیشانەکەم لە گیرفانی چاکەتەکەمدا هێشتەوە، پاشان خستمە نێو کەلوپەلەکانی ترەوە. نەمدەویست چیتر ئەم ناونیشانەم هەبێ.

جارجاره حەزم دەکرد تەلەفۆنێکی بۆ بکەم و لێی بپرسم حاڵی چۆنە، بەڵام ڕۆنی تەلەفۆنی نەبوو. هەر وا دیدارەکەم دوا دەخست، تا دواجار بە یەکجاری لە بیرم چووەوە.

هەموو ڕۆژێ دەچوومە سەر کار و پاشان ڕێم دەخستە کتێبخانە. بەختەوەرانە، چیتر چاوم پێی نەکەوتەوە.

ئەوەی ڕاستی بێ من چووبوومە نێو فەزایەکی نوێی ژیانمەوە، هیوادار بووم ئەم پێگەیە بمپارێزێ. دەمویست کەم تا زۆر وەک ئەوانی تر و بە شێوەیەکی ئاسایی بژیم، بنەماڵە کۆنەکەم بەو شێوەیە دابمەزرێنمەوە کە پێشتر هەمبوو.

دەمزانی چیم بەسەر هاتووە؛ لە پیاوێکی چوست و چالاکەوە، کتوپڕ ببوومە هیچ. زۆر باش لەوە تێدەگەیشتم بۆچی بنەماڵەکەم لێک دابڕاوە. من بە تەنیا بەرپرسیار نەبووم، من ئەوەندە بێهێز نەبووم نەتوانم بنەماڵەیەک لە دەرەوەی سنوورەکانی ژینگە ئاشناکەم بپارێزم.

وێدەچوو کە نەمەوێ چیتر سەرنج بە هاوسەرەکەم بدەم کە ئەو مافێکی زیاتری دەویست و منیش دانم پێدا نەدەنا، بەڵام وا نەبوو، ئەم بارودۆخە پەیوەندیی بە منەوە نەبوو. باسەکە نە ماف بوو و نە گوێپێدان، بەڵکە شتێکی تر بوو، شتێکی تەواو جیاواز. ئەوەی ڕاستی بێ من ئیتر شتێکی سەرنجڕاکێشم نەبوو پێشکەشی بکەم.

لە وڵاتەکەی خۆم ئاسۆیەکم بۆ پێشەڕۆژ هەبوو، دۆخی ژیانم ڕوون و ئاشکرا بوو، ئەندامی حزبێک بووم کە نیازی گۆرانکاریی گەورە بوو. بەڵام ئێستا چی بووم؟ پیاوێک کە بە کاری بچووکەوە سەرقاڵە.

هەق بە هاوسەرەکەم بوو، بەڵام نەمدەتوانی یارمەتیی بدەم. من لە بن چنگی شەپۆلان دابووم. ئەگەر لە جێگەی ئەو بوایەم، چیتر هەوڵم نەدەدا پشتیوانیی مێردەکەم بەدەست بێنم. لە **هۆڵەندا** دەیتوانی بە بێ من بەڕەی خۆی لە ئاو دەرکێشێ. ئیتر نە باوک هەبوو، نە دایک، نە برا، نە ئاشنا، ئیتر دەوروبەر گوشاری لێ نەدەکرد بۆ ئەوەی خۆی لەگەڵ پیاوێک ڕابێنێ کە ئیدی ڕووخابوو.

ناهەقی نەبوو؛ پیاوێک کە دەیویست پەی بە سەرجەم کەلێنەکانی کۆچ بەرێ، دەیتوانی چ یارمەتییەکی بدا؟ پیاوێک کە لە شایەتیدان زیاتر بیری لە هیچ شتێکی تر نەدەکردەوە، دەیتوانی بە چ شێوەیەک یارمەتیی بدا؟ هاواری دەکرد: "ئاخر توخوا بۆ کێ دەتەوێ ببی بە شایەت؟ بۆ شایەتیدان دەتەوێ بچیتە کوێ؟"

کێشەکەی ئێمە نەدەگەڕایەوە بۆ دوێنێ، لەمێژینە بوو. **هۆڵەندا** ئەم گرفتە ئاڵۆزەی هێندەی دیکە قووڵتر کردبووەوە. من لە ناوم بردبوو. هەمیشە بەرەو بۆچوونەکانی خۆم، بۆ نێو سیاسەت و چالاکییە نهێنییەکانم پەلکێشم کردووە. هەق بەو بوو، مافی ئەوەی هەبوو خۆی ژیانی خۆی هەڵببژێرێ، داهاتووی

خـــۆی لە نێـــو کـــۆمەڵگەیەکی نوێـــدا دابمەزرێنـــێ، کـــۆمەڵگەیەک کە ژنـــان چیتـــر پێویســـتیان بە پیـــاوی ڕووخاو نەبوو.

بۆ من ئەوەندە بەس بوو چاوەڕوانی ڕەوینەوەی ئەو شـەوەزەنگە بـم کە خسـتبوومیە نێـو کـۆچ و هەڵاتـنەوە. پاشان دەمتوانی ببینم چی لە کەسایەتیم ماوەتەوە.

## ١٥

مەلەکان دەیانجریواند، درەختەکان دەبووژانەوە، بە ئاوی باران مەلەیان دەکرد و خەشڵ و مووررووی مەیلەو کەسکی بەھاریان بە خۆوە دەکرد. بەڵام دارھەڵووژەکە لق و پۆپی دەرنەکرد.

تاسەی ڕۆنیم کردبوو.

بە خۆمم گوت: "دەبێ سەردانێکی بکەم. ئەمرۆ دەچم و دەیبینم."

دەفتەر و کاغەزەکانم گەڕام بۆ ئەوەی ناونیشانەکەی بدۆزمەوە، ناونیشانەکەیم لە ڕۆژژمێرێکی کۆنی گیرفانیدا یادداشت کردبوو.

لە گەڕەکێک دەژیا کە لە دەرەوەی نێوەندی شار هەڵکەوتبوو. ئەم گەڕەکەی شار ناوبانگێکی خراپی هەبوو، بەڵام تا ئەوکات هێشتا نەمزانیبوو. کە بە پاسکیل کۆڵانە و کۆڵان دەچووم تا ماڵەکەی ڕۆنی بدۆزمەوە، بۆم دەرکەوت ژینگەی ئەوێ لە شوێنەکانی تر ناچێ. گەڕەکێکی ڕووت و قووت بوو، بێ داروودرەخت، بێ جریوەی مەلەکانی دەستپێکی وەرزی بەھار. ماڵەکان یان زۆر کۆن بوون یان نوێ،

خانووەکـانی نیشـتەجێبوون بە کەرەسـتەی پێشـوەخت دروسـتکراو سـاز کرابـوون. لەگەڵ ئەوەشـدا لە هەمـوو لایەکەوە ئەو پیـــاوانەت دەبینـــی کە خەریکـــی نـــووژەنکردنەوەی ئۆتۆمبێلەکانیـــان بـــوون، کـــۆمەڵە پیاوێکی خاڵکوتکراو، ڕیشن، مووی سەریان بە شێوازی شەپقەی تەربووش چاککراو، هەروەها کۆمەڵێک ژن بە تەنوورەی کورت و ورگی زلەوە، کۆمەڵێک ژنی لەچکە بە سـەر بە چـاکەتی درێژەوە. لە سـووچێکی گەڕەکەکە دوو سـێ بەقـاڵی بیـانی لە تەنیشـت یەکتـری بەدی دەکـــران. تەنەکە خۆڵەکـــان پڕاوپـــڕ بـــوون، لێیـــان دەڕژایەوە. کەس نەیـــدەزانی ڕێـــگە بە کوێـــدایە، کەس **ڕۆنی** ناوێکی نەبیستبوو.

ماڵەکـان پلاکیـان نەبـوو و ژمـارەی سـەر تـابلۆی کۆلانەکـان نەدەخـوێنرانەوە، لەگەڵ ئەمەشـدا **ڕۆنـی** لە بەرامـبەر بەقاڵەکـان لە سـووچێکی گەڕەکەکە دەژیـا. ویستم دوگمەی زەنگەکە دابگرم، بەڵام زەنگەکە کاری نەدەکرد، لە پەناوە کۆمەڵێک بەن هەڵواسـرابوون. **ڕۆنـی** ڕێک لە سەرەوە دەژیا؛ ژێرەوە جۆرێک گەنجینە بوو.

دەبوایە هاوار بکەم: "هەلەو! لێرەی؟"

هێشـتا زۆر تاریـک دانەهـاتبوو، گڵـۆپی هەنـدێک لە ماڵەکان دایسا، بەڵام پەنجەرەکەی مـاڵی **ڕۆنی** ڕووناک نەبـــوو. لەوە ترســـام نەکـــا هەمـــدیس مـــاڵەکەی گواسـتبێتەوە. مـاڵەکە بە لای چەپـدا جیرانـی نەبـوو، مـــاڵەکەی لای ڕاســـتیش چـــۆڵ بـــوو. دەرگەکەی بە

تەختەیەک کلۆم کرابوو. لە ماڵەکەی ئەولاتر ڕووناکی هەبوو، لە دەرگەم دا، بەڵام هیچ کاردانەوەیەک نەبیسترا. بە ئەسپایی ئەو بەنەم ڕاکێشا کە بە سندووقی پۆستی نێو دەرگەکەدا هاتبووە دەرێ و دەرگەکەم کردەوە. ئاوازێک بەرز بووەوە و دەرگەکە خۆی کرایەوە.

ژنێکی قەڵەوی ئەسمەر، کە بۆنی لە خۆی دابوو و سووراوێکی زۆری کردبوو، بەرەو پیرم هات.

پێی گوتم:

- چ بووە؟

- ببوورن، دەمویست بزانم جیرانەکەتان ئێستاش لێرە دەژی.

بە شێوەزارێک کە بە لامەوە نامۆ بوو، گوتی:

- کام جیران؟

- **ڕۆنی**.

- نایناسم. هەرگیز نەمبینیوە.

وای گوت و دەرگەکەی پێوە دا.

دەمویست بگەڕێمەوە ماڵێ، لەناکاو بینیم شۆقێک لە پەنجەرەی ماڵەکەی **ڕۆنی**وە دەرێی ڕووناک کردەوە.

بە دەنگێکی بەرز هاوارم کرد: "هەلەو! **ڕۆنی**! لە ماڵی؟"

جارێکی تر هاوارم کرد: "هەلەو! هەلەو!"

گوێی لە دەنگم نەدەبوو، بەردێکی بچووم دەست دایە و بە پەنجەرەکەیمدا دا. بەردێکی ترم فڕێ دا،

سووودێکی نەبوو. بەردێکی گەورەترم دەست دایە و هاویشتم.

ڕوخساری **ڕۆنی** لەودیو پەنجەرەوە بەدەر کەوت. پەنجەرەکەی کردەوە، سەری هێنایە دەرەوە و پرسی:

- چ باسە؟

- **ڕۆنی**! منم.

تاریک بوو و منی نەدەناسییەوە.

"کێ؟"

وەڵامم دایەوە: "منم. دەرگەکە بکەوە!"

بە هێمنی گوتی: "ئێ، **بولفەزل**ی خۆمان."

هاتە خوار و دەرگەکەی کردەوە، کەمێک باشتر دیار بوو. هەناسەی بۆنی کحولی لێ دەهات. لەگەڵیدا ڕاحەت نەبووم، نەمتوانی وەک جاران قسە و باسی لەگەڵدا دابەستم.

بە کۆمەڵێک پلیکانەی بەرتەسکدا سەرکەوتم.

بە درۆ گوتم: ناونیشانەکەتم لێ ون ببوو و لە نێو شاریش ئیتر تۆم نەدەبینییەوە. ئەمڕۆ لەناکاو بە خۆمم گوت، پێویستە بچم **ڕۆنی** ببینم. کاغەز و وردەواڵەکانم پشکنی و ناونیشانەکەتم دۆزییەوە."

**ڕۆنی** گوتی: "لە بەر دەرگە ڕامەوەستە، فەرموو وەرە ژوورێ!"

وە ژوور کەوتم، پەرداخە شەرابێکی نیوەبەتاڵ لە سەر مێزەکە دانرابوو.

پرسی:

- پەرداخێکیش بۆ تۆ دابگرم؟
- نا، سوپاس. نامەوێ ئێستا بخۆمەوە. یەکسەر دەگەڕێمەوە. ویستم بزانم لە کوێ دەژیت. جارێکی تر خۆم و هاوسەرەکەم دێین.
- ئەی بۆ قاوەیەک دەڵێی چی؟
- بەڵێ، دەخۆمەوە.
چوو قاوەیەک ساز بکات و منیش لە پەنجەرەکە نزیک بوومەوە.
ئێستا ئیتر چرای هەموو ماڵەکان دایسان. گەڕەکەکە منی بە بیر کاروانسەرا خستبووەوە، شوێنێکی کاتی کە ڕێبوارەکان ماوەیەک تیایدا پشوو دەدەن و پاشان ملی ڕێگە دەگرنەوە، ئەو ڕێبوارانەی بە پێویستیان دەبینی تاوە و جێگەوبانەکانیان لە پاش خۆیان جێ بهێڵن.
ڕۆنی بەدەم سازکردنی قاوەوە پرسی:
- هاوسەر و کوڕەکەت چۆنن؟
- باشن.
- هاوسەرەکەت هەر دەچێتە کۆرسی زمان؟
- دوو شەو لە هەفتەدا دەچێ.
- ئێستا هۆڵەندی باش قسە دەکا؟
- پێم وایە باش قسە دەکا، زۆر جار دەیبینم لەگەڵ جیرانەکان گفتوگۆ دەکا.
- تۆش باش قسە دەکەی، پێشکەوتنی باشت بە خۆوە بینیوە.

هەوڵـم دا پێـی بڵـێم دەبـێ ڕۆیشـتن بـۆ کتێبخـانە و خوێندنەوەی کتێب بێ ئەنجام نەبوون و شتێکی تریش بە قسەکەمەوە زیاد بکەم، بەڵام هیچم نەگوت.

ژووری ڕۆنیشـــتن چـــۆڵ بـــوو، تەنیـــا دوو قەنەفە، مەکینەیەکی کارەبایی قاوە و دوو سێ کەرەستەی تر دەبینـــران. دیوارەکـــان ڕووتوقـــووت بـــوون و هـــیچ وێنەیەکیان پێوە هەڵنەواسرابوو.

- دڵخۆشیت لێرە دەژیت، بە ئێرە ڕازیت؟

- خراپ نییە.

- لەگەڵ جیرانەکانت پەیوەندیت چۆنە؟

- جیرانی چی! لێرە کەس هەوڵ نادا پەیوەندیی لەگەڵ ئەوی تردا هەبێ.

- وەکو تر چ دەکەی؟

- ئەوەی ڕاستی بێ هـیچ. بەڵام بنکەیەکی پەنـابەران لەم نزیکـانە هەیە، هەفتـانە دوو سـێ کـاتژمێر دەچـمە ئەوێ.

- لەوێ چ دەکەی؟

- خەڵک جلی دەستی دوو دێنن بۆ ئەوێ، گوڵبژێریان دەکەم و بە جلئاوێزەکانیـــانەوە هەڵدەواســـم. ئینجـــا پەنابەرەکـــان دێـــن، جلەکانیـــان پـــێ تـــاقی دەکەمەوە، دەیانخەمە نێو ساکێک و پێیان دەدەم.

لە قوژبنێکی ژوورەکە، لە بان قەرەوێڵەکەی تابلۆیەکی کـۆنی چوارچێـوەدار هەبـوو. ڕەنگـی سـەر تـابلۆکە

لەملاولا لێ ببووەوە و بە هۆی ئەوەی چینێک تۆز لە سەری نیشتبوو، نەمدەزانی چییە.

- ئەم تابلۆیە چییە؟

- شەمەندەفەرە.

لە نێو تابلۆکەدا شەمەندەفەرم نەدەبینی. بە پەڕۆیەک تۆزەکەم سڕییەوە، ئەوجا بینیم؛ شەمەندەفەرێکی مۆدێل کۆن و بە ڕەنگێکی سووری تۆخی مەیلەوقاوەیی. شەمەندەفەرەکە لە پشت چەند تەپۆلکەیەکەوە دەهاتە دەر و چڕەدووکەڵی لێ بەرز ببووەوە، شۆفیرەکەی لە نێو دووکەڵدا ون ببوو و موسافیرەکان نەدەبینران.

هەوڵم دا کەسێک بە دی بکەم بەڵام مەحاڵ بوو، واگۆنی موسافیرەکان تاریک بوو. لەگەڵ ئەوەشدا لە سەر ئەو بڕوایە بووم کە دەبوایە لایەنی کەم ڕێبوارێک بەدیارەوە بێ. چاوەکانم تروووکاند و هەوڵم دا لەودیو مژۆڵەکانمەوە کەسێک لە نێو ژوورەکاندا بدۆزمەوە، چۆڵ و هۆڵ بوون.

- ئەم تابلۆیە هی تۆیە؟ مەبەستم ئەوەیە بڵێم تۆ کێشاوتۆتەوە؟ کارێکی کۆنتە و لە گەنجینە ماوەتەوە؟

- نا، لە بازاڕی کۆنەکە کڕیومە.

ئەم شەمەندەفەرە کاری تێکردم؛ لەو شەمەندەفەرە دەچوو کە خۆی بە خەونەکانمدا دەکرد و بەم جۆرە لە نێو تاریکی و لە پشت تەپۆلکەکانەوە دەهاتە پێش.

لەولای گوندەکەمان، لە نێو تەپۆڵکەکاندا، ڕێگەیەکی ئاسنیی نوێ کە بەرەو ڕۆژهەلاتی دوور دەچوو، دروست کرابوو. من تا ئەو کاتە هێشتا شەمەندەفەرم نەبینیبوو، شەوێک لەناکاو دەنگی فیکەیەکی درێژ و هارەهارِی جارزکاری چەرخەکان بەرز بووەوە.

"ئەم دەنگە هیی چییە؟"

دایکم گوتی:

- دەنگی قەتارە.

- قەتار چییە دایە؟

- کەرەستەیەکی گواستنەوەیە و دەیان تەگەری هەیە کە بە سەر ڕێگەیەکی ئاسندا دەڕوا.

- ئەی ڕێبوارەکان؟

- لە نێو ژوورەکان دادەنیشن و تایەکان قەتارەکە بەرەو پێشەوە دەبەن.

- کێ تایەکان دەجوولێنێ؟

- شۆفیر، پیاوێکە لەودیو پەنجەرەیەک، لە پێشەوەی قەتارەکە دانیشتووە.

- ڕێبوارەکان دەچنە کوێ؟

- دەڕۆن کورم، دەڕۆن.

- باشە دەڕۆنە کوێ دایە؟ بۆ کوێ دەڕۆن؟

- دوور دەڕۆن. زۆر دوور.

پاشان هەفتەی جارێک شەمەندەفەرێک بەدیار دەکەوت، شەمەندەفەرێکی دووورودرێژ کە جارێک دەچووە ڕۆژهەلاتی دوور و جارەکەی تر لە

ڕۆژهەڵاتی دوورەوە دەگەڕایەوە. منداڵەکان دەچوونە سەر تەپۆڵکەکان تاکو دەست بۆ ڕێبوارەکان ڕابوەشێنن و بە سەرسوورمانەوە دەمبینی شەمەندەفەرەکە دوور دەکەوتەوە و لە دووردەستدا ون دەبوو. دەمویست سواری شەمەندەفەر بم، پێم خۆش بوو منیش ڕێبوارێک بم لەودیو یەکێک لەو پەنجەرانە دابنیشم و بڕۆم، سەفەر بکەم، بەڵام وێدەچوو مەحاڵ بێ.

**ڕۆنی** پرسی:

- قاوەی چۆن دەخۆیتەوە؟

- بە شیرەوە، شیرەکەی زۆر نەبێ بێ زەحمەت.

کوپە قاوەکەی بۆ هێنام و بێ ئەوەی قسەیەک بکا لە پەنامەوە ڕاوەستا. بە دوای چەند وشەیەکدا دەگەڕام بۆ ئەوەی درێژە بە قسەکانمان بدەین،

بەڵام بێ کەڵک بوو. دۆسیەی **ڕۆنی** لە مندا بەسترابوو؛ هەستم دەکرد **ڕۆنی** ڕۆیشتووە. بۆ کەسێکیش کە ڕۆیشتبێ، وشەکان نایەنە سەر زمان.

## ١٦

چیتـــر تووشـــی ڕۆنـــیێ نەدەهـــاتم، بە یەکجـــاری بێسەروشـوێن ببـوو. بە لامەوە مـایەی سەرسـووڕمان بوو. ئێستا کە ئیتر تووشی نەدەهاتم، نەبوونی پەژارەی دەخستە دڵمەوە. بەس دەمتوانی بچمە سەردانی و بزانم چلۆنە و لێی بپرسم بۆچی ئیتر نایەتە نێو شار.

بەڵام دەترســـام، لەوە دەترســـام هەر کە پـێم نـــایە مـــاڵەکەی بەســـەر شـتێکی چـاوەڕواننەکراودا بـکەوم. دەبـوایە ســەرەتا لە دەرگە بـدەم و پاشـان بانـگ بـکەم. "هەلەو! هەلەو! لەوێی کاکە؟"

ئینجا دەبـوایە چەنـد وردە بەردێـک بهاوێژم و دواجار بۆ وەرگرتنی زانیاری ڕوو بکەمە جیرانەکەی.

- خاتوون، دەتوانم پرسیارێکتان لێ بکەم؟

- فەرموون.

- جیرانەکەتـان مـاڵەکەی گواسـتووەتەوە؟ دوایـین جـار کەی بینیوتانە؟

نـا نەمدەویســت بچــمە مــاڵی ڕۆنــیێ، حەزم نەدەکـرد شـوێنەواری بدۆزمەوە. لەوە دەترسـام جیرانەکەی پێم بڵێ: "چووزانم! من چۆن دەبێ بزانم؟" کەواتە دەبوایە

تەلەفۆنم بۆ پۆلیس بکردایە: "نەخێر، ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە نییە. بەڵێ، بەڵێ، من پەنابەرم. نەخێر. ئەوەی ڕاستی بێ، بۆچی، جیرانێکی کۆنی... ترسم هەیە، بەڵێ ترس لەوەیماڵەکەی... نازانم... ناونیشانی من؟ ئەها! ناونیشانی وی، ناونیشانی ماڵی ڕۆنی. ئەها وایە! جا لە بیرم چووەتەوە. پاشناوەکەی؟ نەخێر، بەڵێ، لە سەر زارمە، خولەکێک. ژمارەی کۆڵانەکەی. داوای لێبووردن دەکەم. وایە. بەڵام بە دڵنیاییەوە، ڕۆنی ناوێکە. نەخێر."

نا، نەمدەویست بەدووی بکەوم، لە ماڵەکەیدا بیدۆزمەوە. پێم باشتر بوو لێگەڕێم شتەکان ڕەوتی ئاسایی خۆیان تەی بکەن. ڕۆنیم لەبیر چووەوە، ئەگەر پێویست بوایە هەواڵیم دەپرسی.

هەروا لە کارگەی قوتووی کۆنسێرو کارم دەکرد.

بە هۆی ئەوەی زۆر لە ماڵێ نەبووم، جیرانەکان دەهاتنە ماڵی ئێمە. هاوسەرەکەم دەیتوانی بە سانایی لێیان بپرسێ: "وەرەن پیاڵەچایەکم لەگەڵدا بخۆنەوە."

ئەمنیش دەمتوانی وا بڵێم، بەڵام دەبوایە سەرەتا بیر بکەمەوە و بزانم پێکهاتەی ڕێزمانیی ڕستەکە چۆنە.

دەمبیست دەڵێن: "قاوەکەت چیی تێدا بێ؟"

بە بۆچوونی من ئەمە هەڵە بوو، ئەم ڕستەیە خراپ داڕێژراوە. پێم وا بوو دەبێ پرسیارەکە بەم جۆرە بێ: "قاوەت چۆن پێ خۆشە؟ بە شیرەوە یان بێ شیر؟"

هاوسەرەکەم شێوەزاری پێوە دیار نەبوو، بەڵام شێوازی دەربڕینی من کەموکوڕیی هەبوو. لە کارگە پێویستیم بە قسەکردن نەبوو، دەبوایە بە درێژایی ڕۆژ بێدەنگ بم و ڕیزی قوتووەکانم قەت لە بەر چاو ون نەبێ.

کوڕەکەشم گەیشتبووەوە من، من چەندین کیلۆمەتر لەگەڵ ئەودا مەودام هەبوو. هاوسەرەکەم جیرانەکانی هەبوون، کوڕەکەم هاوڕێیانی، منیش تەلەفۆنم هەبوو.

بەردەوام چاوەڕوانی زەنگی تەلەفۆن بووم، بیرم دەکردەوە کەسێک تەلەفۆنم بۆ دەکا و کارەساتێکم پێ ڕادەگەیەنێ.

"دایەگەورە مرد."

"سەرەخۆشیت لێ دەکەم، باوکت کەوت و چیتر هەڵنەستایەوە."

"ماممان کۆچی دوایی کرد."

"دایکت نەخۆشە."

"پوورت لە سەر جێگە کەوتووە."

بەڵام تەلەفۆنەکە کپ و مات بوو، مردبوو.

چیرۆکەکەم دەزانی. دەبوایە پشکی منیشی تێدا بێ، دەبوایە ڕۆژێک تەلەفۆنەکە زەنگ لێ بدا و کەسێک بە هۆڵەندی پرسیاری کردبا:

- دەتوانم لەگەڵ **بولفەزل** قسە بکەم؟

- **بولفەزل**تان لەگەڵدایە.

شتەکان دەبوایە بەم جۆرە ڕوو بدەن.

دواجـار تەلەفـۆنەکە زەنگـی لێـدا. بـێ ئەوەی پەلەم کردبـێ، وازم لـێ هێنـا چەنـد جـار لەسـەر یەک زەنـگ بخوا. پاشان هەڵمگرت.

- ئەلۆ!

- منم.

دەنگێکی ژنانە وای گوت.

- جەنابتان کێن؟

- هاوسـەری پێشـووی **ڕۆنـێ**. دەبـێ هەواڵێکـی ناخۆشتان پێ ڕابگەیەنم.

- هەواڵی چی؟

- **ڕۆنێ** مردووە.

ڕاچەنـیم. کتـوپڕ ڕوخسـاری هـاتە پـێش چـاوم، ڕوخسـاری ئەو کـاتەی وا لە بەردەم پەرژیـنەکە ڕاوەسـتابوو و دەیگـوت: "**بـولفەزل**، مـاڵەکەم دەگوازمەوە."

- مردووە؟! چۆناوچۆن مردووە خاتوون؟!

- بە هۆی ڕووداوێکەوە.

- چ قەوماوە؟!

- خۆی کوشتووە.

بۆ ساتێک کڕوکپ بووم.

- **ڕۆنێ**؟! خۆکوشتن؟! ناتوانم بڕوا بکەم. بە چی خۆی کوشتووە؟! کەی؟!

- پێرێ.

- باشە چۆن؟!

ئەیگوت چۆن خۆی کوشتووە، منیش پرسیارەکەمم دووپات نەکردەوە. تێگەیشتبووم لەگەڵ هۆڵەندییەکاندا نابێ پێداگری لەسەر شتێک بکەی، بۆ درکاندنی وردەکارییەکان لەچەرن. بێجگە لەو شتانەی کە دەیانەوێ بزانرێ، هیچ شتێکی تر نابیستی.

- خاتوون، نازانم بڵێم چی. هاوبەشی خەمتانم. **رۆنی** بۆ من جیرانێکی باش بوو... بێگومان بیری دەکەم. سوپاس بۆ تەلەفۆنەکەتان. ئاخۆ دەتوانم بزانم کەی بەخاک دەسپێردرێ؟

- وەسیەتنامەیەکی جێ هێشتووە.

پرسیم: "وەسیەتنامە؟" نا، نەمپرسی، وشەکەم دووپات کردەوە بۆ ئەوەی واتای وشەکەم بە بیر بێتەوە.

"نا، وەسیەتنامە نا، بەڵکو کارت پۆستاڵێکی رەنگی.

من پێشتر هەرگیز گوێم لەم دەستەواژە هۆڵەندییە نەببوو.

- کارت پۆستاڵێک، چۆن کارتێکە؟

- کارتێکی سادەیە.

- ئەها، کارتێک کە بە نیگار یان وێنەیەک رازاوەتەوە؟

- خۆیەتی! پۆلیس لە گیرفانی چاکەتەکەیدا دۆزیویەتییەوە، بۆ منیان ناردووە. ناوی ئێوەیشی لە سەر نووسراوە.

- ناوی من؟ ئەی چی تری لە سەر نووسراوە؟

- داوای لــــێ کــــردووم جەســــتەکەی بســــووتێنم. نووســـیویەتی حەز دەکـا کەس بەشـداریی مەڕاســیمی سووتانەکە نەبێ، من و ئێوە نەبین.

- ئەی کچەکەی، دیارە کچەکەتان؟

- بە بێ ئەویش.

ویستم بپرسم بۆچی من، بەڵام بێهوودە بوو. دەمزانـی، بەس دەبـوایە ئامـادە بـم. لە هەر مەڕاسـیمێکی پرسـەدا بەشداریی چەند کەس یاخود چەند شتێک پێویستە.

ئەگەر تەرمێک هەبێ، دەبێ گۆڕێکیش هەبێ.

یان ئینجانەیەک.

یان بـوتڵێکی بەتـاڵ، بۆ ئەوەی خۆڵەمێشـەکەی بخـرێتە ناو.

لە پشت هەر گۆڕێک گۆڕهەڵکەنێک هەیە، لە پشـت هەر بوتڵێکی بەتاڵ بولفەزلێک.

## ١٧

بۆ مەراسیمی سووتاندنی جەستەی هاورێیەک (ئاخۆ **ڕۆنی** هاوڕێی من بوو؟)، جیرانە کۆنەکە، دەمویست جلێکی فەرمی بپۆشم؛ لەبەر ئەوەش بوو شەپقەم کردە سەر.

شەپقە سەرنجی ڕادەکێشام و حەزم دەکرد شەپقەیەکم هەبێ، وەلێ ئەو شەپقە گونجاوەم نەدەدۆزییەوە کە بە دوایدا دەگەڕام. چەند ڕۆژێک بەر لەوەی **ڕۆنی** خۆی بکوژێ، بە پاسکیل خۆم بە گوندێکی بچووکدا کرد. ئەو گوندە ناوی چ بوو؟

وەک هەمیشە بە لامەوە ئەستەم بوو ناوی ئەو گوندانە لە مێشکمدا ڕابگرم کە لە کەنارەکانی **ئەیسێل** هەڵکەوتوون. ئەگەر هەندێک لە ڕۆخ چۆمەکە بە پاسکیل ڕێگەیەکی زۆرت بڕیبا، دواجار لە پڕێکدا بەسەر کۆمەڵێک ماڵ و مەیدانێکی بچووکدا دەکەوتی.

لەوێ بازاڕێکی کەلوپەلی دەستی دوو هەبوو. چەند پیاوێک لە پشت کەوێڵەکانیان ڕاوەستابوون، لە نێوەڕاستی مەیدانەکە دارێکی بەساڵاچوو هەبوو. ژنێکی پیر لەچکەکەی لە ژێر چەنەگەی گرێ دابوو، لە بن دارەکە دانیشتبوو و پاڵی بە نێوقەدییەوە دابوو.

ژنەکە پارچەیەکی لە بەردەم خۆی لە سەر ئەرزەکە ڕاخستبوو و چەند شەپقەیەکی کۆنی لە سەر دانابوو. خێرا لە پاسکیلەکەم دابەزیم و بەرەو لای چووم، شەپقەیەکم هەڵگرت و تاقیم کردەوە؛ ڕێک ئەو شتە بوو کە بە دوایدا وێڵ بووم.

ئاوێنەیەکی بۆ ڕاگرتم، سەیری خۆمم کرد. لێم دەهاتەوە. ئیتر تەواو لە پیاوەکانی ماڵەکەی خۆمان دەچووم، ئەو پیاوانەی چیتر لەوێ نەبوون، ئەو پیاوانەی لە گۆڕستانەکەی گوندەکەمان بە خاک سپێردرابوون.

پارەی شەپقەکەم دا و بە پاسکیل گەڕامەوە.

چوومە هۆڵی مەڕاسیمەکەوە، لە ژێر ڕووناکیدا تابووتێک لە سەر تەختەیەک دانرابوو.

لە سەر تابووتەکەش وێنەیەکی ڕۆنیّ کە چاوی لە من بڕیبوو دانرابوو، ڕۆنیّیەک کە نەخۆش نەبوو، ڕۆنیّیەک کە یادەوەریی ون نەکردبوو، بەڵکو ڕۆنیّیەک بە نیگای قووڵەوە.

ژنێک، واتە هاوسەرەکەی، لە تەنیشت تابووتەکە ڕاوەستابوو، دەسرەیەکی ڕەشی لە سەری وەرپێچابوو و چاویلکەیەکی گەورەی ڕەنگاوڕەنگی لە چاو کردبوو.

لە بەر خۆیەوە شتێکی گوت کە لێی تێنەگەیشتم. پاشان دەستی بەرەو لای من ڕاداشت.

گوتم: "بە داخەوەم."

ئەو شـوێنەی هاوسـەری پێشـووی ڕۆنـیم لـێ دی، شـوێنێکی لەبار نەبوو، سـاتەوەختەکەش سـاتەوەختێکی گونجـاو نەبـوو. لەو شـوێنەی وا مـردوویەک لە پەنـام ڕاکشـابوو، بە هـیچ شـێوەیەک نەمـدەتوانی بڵـێم: "خۆشحاڵم بە ناسینتان. بەردەوام مەراقم کردووە بـزانم هاوسەری **ڕۆنی** کێیە."

لە ڕوخسـاری ورد بـوومەوە و بەدوای پیشـانەیەکدا دەگەڕام **میەترام** بێنێتەوە بیر. گوتم:

- خـاتوون، بمبـوورە برینەکانتـان دەکـولێنمەوە، بەڵام حەز دەکەم زیـاتر ئـاگەداری ڕووداوەکە بـم. مەبەسـتم ئەوەیە، ئـاخۆ دەکرێ بـزانم بە چ شـێوەیەک کۆتـایی بە ژیانی خۆی هێناوە؟

- ئێ، هێشتا نەتانزانیوە؟

- نەخێر، کاتێک تەلەفۆنتان بۆ کردم لێم پرسین، بەڵام وەڵامێکم دەست نەکەوت.

بە ئەسپایی گوتی:

- لە سـەر ڕێـگەی ئاسـن، خـۆی هاوێشـتووەتە بـن شەمەندەفەرێک.

- لە کوێ؟

- لە **ئامستردام**.

ئیتـر پێویسـتی نەدەکـرد گـوێم لە پاشـماوەی بەسـەرهاتەکە بێ، ئاشـنای چیرۆکـی ڕێـگەی ئاسـن و تەرمەکان بووم.

ڕۆژێــــک لە دەرگەیـــان دا. لە پەنـــجەرەڕا ســـــەیری دەرەوەم کرد، دوو پۆلیس لە بەر دەرگە ڕاوەستابوون، پیـاوێکی قەڵەو و ژنێکـی ئەســمەر. دەرگەکەم کـردەوە.

- بە پێی زانیارییەکانی ئێمە، دەبێ **بولفەزل** ناوێک لێرە بژی. ئاخۆ خۆتانن؟

- بەڵێ، منم.

- بوویەرێـــک ڕووی داوە، کەســـێک خـــۆی وە بەر شەمەندەفەر داوە. بڵێی تەرمەکە هـاوولاتیی ئێوە نەبێ؟ نـاوی ئێـوە لە کاغەزێکـدا نووسـرابوو کە لە گیرفـانی چاکەتەکەیدا دۆزیومانەتەوە.

- ناوی من؟

- بەڵێ، ناو و ئەدرەسی ئێوە.

- جا ئێستا من چیم لەدەست دێ بۆ ئێوە؟

- ئەگەر ئەرک نەبێ لەگەڵمان وەرن.

- بۆچی؟

- لەبەر ئەوەی... بەشـکم بـزانن کێیە. ئەوەی ڕاسـتی بێ جگە لە پەسـاپۆرتێکی تەزویـر و نـاوی ئێوە، هـیچ زانیارییەکی ترمان دەرهەق بەو لە بەر دەستدا نییە.

لەگەڵ ئەوەشدا نەمدەتوانی خۆم لە ئەرکی سەر شانم، لە بەرپرسـیارێتیم، یـان بە واتـایەکی تـر لەو پـێگەیەی هەمە بـدزمەوە. دەبـوایە لەگەڵیـان بچـم، لە خـورت و خـۆڕایی نیـیە ناونیشـانی مـن لە بـاخەڵی چـاکەتی تەرمەکەدا دۆزراوەتەوە.

به پۆلیسەکەم گوت: "دەتوانن خولەکێک لەسەرم ڕاوەستن؟ دەبێ خۆم بگۆڕم."

گوتی: "لە نێو ئۆتۆمبێلەکەدا چاوەڕوانت دەبین."

چوومە نهۆمی سەرەوە، ئیتر ئەو وادەیە هاتبوو. قاتەکەم پۆشی و چوومە بەردەم ئاوێنە.

"خوێنسارد بە و لۆژیکانە بیر بکەرەوە."

پاشان بە هێمنی بەرەو ئۆتۆمبێلی پۆلیس هەنگاوم نا، ژنە ئەسمەرەکە دەرگەی لێ کردمەوە، منیان بردە نەخۆشخانەی شار. بە چەند پلیکانەیەکدا چووینە خوارێ کە بەرەو ساردخانە کۆتایی دەهات، من لە نێوەڕاستەوە لەگەڵ پۆلیسەکە ڕێم دەکرد و ژنە ئەسمەرەکەش لای دەستی چەپم بوو.

پیاوێکی بلووز سپی دەرگەکەی کردەوە، چوومە ژوورێ. سارد بوو، سەرمایەکی سامناک.

پزیشکی یاسایی چەکمەجەیەکی گەورەی یەکێک لە ڕیزە درێژەکانی کردەوە. تەرمێک بەدەر کەوت، تەرمێک کە لە پارچەیەکی سپی پێچرابووەوە. خۆزیا شەپقەیەکم هەبا تا بە نیشانەی ڕێزگرتن لە تەرمەکە کە ناونیشانی منی پێ بووە، بەرزم کردباوە. پۆلیسەکە ئاماژەیەکی کرد، پیاوەکە مەلافەکەی لا دا.

یەکەم جار نەبوو چاوم بە مردوو و بە تەرم دەکەوت. ڕەنگەکەیشی بە لامەوە ئاشنا بوو، پێستی تەرمی براکەم ڕێک لە ڕەنگی مانگی تەواوی پشت چیاکان دەچوو.

پۆلیسەکە پرسی: "ئاخۆ دەیناسن؟"

شـەمەندەفەرێک دەسـتی چەپ و شـان و گەردنـی پـان کردبووەوە و سـەری وردوخـاش کردبوو. کەڵـلەسەری بەتـاڵ بـوو، مێشـکی خرابـووە نـاو نـایلۆنێکەوە و لە تەنیشت تەرمەکەی دانرابوو.

پۆلیسەکە دووبارەی کردەوە: "ئاخۆ دەیناسن؟"

ڕوخســـــاری هەپـــــروون بە هەپـــــرووون ببـــــوو، نەدەناسـرایەوە. سـەرباری ئەوەش مەحـاڵ نەبـوو. بە نهێنـــی لە نێــو ســـاکە پلاســـتیکەکەم ڕوانـــی کە لە مـــاددەیەکی خۆڵەمێشـــی بـــوو، ســـاکەکە بیـــرەوەرییە مردووکـــانی لە نێـــو خۆیـــدا حەشـــار دابـــوو، کە ئەو بیرەوەرییە مـردووانەش بە هەمـان شـێوە بۆ مـن ئاشـنا بـوون. هێمـای ماڵێـک، قسـە نەرمونیـان و گەرمەکـانی خۆشەویستێک، چاوی ڕەش و بۆنی مەمکە تورتەکانی.

ئەگەر من نەیناسمەوە، ئەی کێ دەبێ بیناسێتەوە؟

بە دەنگێکی گیراو گوتم:

- بەڵێ، دەیناسمەوە.

- دڵنیان؟

دیسان سەیری تەرمەکەم کردەوە.

- بەڵێ خانمی پۆلیس، دڵنیام.

- ئەگەر وا بێ دەتوانن ئێرە واژۆ بکەن؟

- بەڵێ خاتوون.

وام گوت و بە وشکی کاغەزەکەم واژۆ کرد.

بە لای مـــنەوە گرنگییەکـــی ئەوتـــۆی نەبـــوو ئەوان سەبارەت بە هەڵسوکەوتە زبرەکەم چۆن بیر دەکەنەوە،

بەس ئەوەندەم دەزانی کە ئەوە تاکە ئەرکێکە دەتوانم بە جێی بێنم. دەبوایە باش بڕوانم، باش گوێ بگرم و هەموو شتێ باش ڕابگرم. تۆ بڵێی ڕۆژێک بتوانم بگێڕمەوە شاربەدەربوون چ مانایەک دەگەیەنێ؟

پزیشکە یاساییەکە مەلافەکەی بە سەر تەرمەکەدا دایەوە و ویستی پاڵ بە چەکمەجەکەوە بنێتەوە.

"ڕاوەستن تکایە. چرکەیەک بێدەنگ بن."

لەو شوێنەی لێی بووم نەمدەزانی قیبلە دەکەوێتە کام لا، ژێرزەمینەکە پەنجەرەی نەبوو. دەبوایە سەیری هەڵکەوتەی خۆر بکەم بۆ ئەوەی بزانم **مەککە** لە کام لایە، ئەوسا ئاراستەیەکی هەڕەمەکیم هەڵبژارد و هەستامە سەر پێ، پۆلیسەکان شەپقەکانیان هەڵگرت. خۆم لە شوێنی براگەورە دانا و ئەو شتەم کرد کە لە نیشتمانی خۆمان ئەنجامی دەدەین؛ دەستم لە سەر ئەو شوێنەی پارچەکە دانا کە دەبێ چاوەکانی تەرمەکەی لێ بووبێ و گوتم: "وإنا إليه راجعون."

ئیتر **ڕۆنێ** لە نێو تابووتەکەیدا دەحەسایەوە.

دەرگەیەک کرایەوە، زێوان هات و ڕایگەیاند: "دەتوانین دەست پێ بکەین؟"

ژنەکە سەیری منی کرد.

گوتم: "با دەست پێ بکەین!"

من چوومە پێش وێنەکەی **ڕۆنێ** و لە بەر خۆمەوە گوتم: "وإنا إليه راجعون."

## ١٨

لە وڵاتــی مــن قەدەغەیە یادەوەرەییەکانمــان بکەیــنە خــۆڵەمێش، ئەو شــوێنەی دەبێــتە جــێ هەواری یادەوەرییەکــان دەبــێ دەســتی لــێ نەدرێ. مــردوو دەشۆردرێ و لە کفنێکی سپییەوە وەردەپێچرێ. پاشـان جەســتەکە بە لای ڕاســتدا دەخــرێتە نێــو گــۆڕەوە و ڕوویشــی دەکــرێتە قیـبلەوە. دواتـر کـوڕی گەورە یـان برای گەورە یان مامی هەرە بەتەمەن، کونێک لە کفنەکە لە کن چاوەکان دروست دەکا. شەو فریشتەی مەرگ بە گڕسـۆزێکەوە دێ، دەبـێ چـاو لێـک نەنێـی و دابنیشــی تاکو وەڵامی پرسیارەکان بدەیتەوە:

- ئەتۆ کێی؟
- **بولفەزل.**
- کوڕی کێی؟
- کوڕی **ئەکبەر.**
- دایکت ناوی چییە؟
- **زەهرا.**
- لە ژیانتدا چ کارە بووی؟

– باسی کام قۆناغ دەکەی فریشتەکە؟ باسی ئەو قۆناغە دەکەی کە لە نیشتمانی خۆم بووم؟ یان ئەو ماوەیەی لە **هۆڵەندا** ژیام؟

چ ڕوو دەدا گەر فریشتەی مەرگ بێت و تۆ هیچ شتێکت بۆ گوتن پێ نەبێ؟

بە درێژایی ئەو ساڵانەی دوایی، کە شەڕ لە وڵاتەکەم پەرەی سەندبوو، لە بەرەکانەوە تەرمی هەنجنهەنجنبوو دەهێنرانەوە.

"چ لەو جەستەیە بکرێ کە کاسەسەری بەتاڵە؟"

لە لای ئێمە قەدەغە بوو تەرمەکان بسووتێنرێن، بەڵام خۆڵەمێش زۆر جار لە چیرۆکە کۆنە فارسییەکاندا بە دی دەکرێ.

"دێوێک، کە هەموو ڕۆژێ پێچەوانەی ئەو شتەی دەکرد کە داوایان لێ کردبوو، **ڕۆستەمی قارەمان**ی لە بان سەری بەرز کردەوە و گوڕاندی: 'لە نێوان ئاو و ئاگردا یەکێکیان هەڵبژێرە!'

**ڕۆستەم** هەرچەند نەیدەزانی مەلە بکا، هاواری کرد: 'ئاو'.

دێوەکە خستییە نێو ئاگرەوە.

'ئەی ئاگرەکە! بیرەوەرییەکانی بسڕەوە!'

خۆڵەمێش سەمبولی دێو بوو، کە کچ و ژنە گەنجەکانی ئەشکەنجە دەدا. دواجار پاش حەوت ڕۆژ و حەوت شەو ململانێ، **ڕۆستەم** توانی دێوەکە لە بان سەری بەرز بکاتەوە و بیخاتە نێو ئاگرەوە. جەژنی خۆڵەمێش بوو، هەر کەسە و مافی ئەوەی پێ درابوو بوتڵێک

لەگەڵ خۆیدا بێنێ. بوتڵەکان پڕ دەکران لە خۆڵەمێش و لە سەر ئاگردان دادەنران."

ئەو کاتەی منداڵ بووم و دەبوایە بەردەوام چاودێریی زۆپای ماڵەکەمان بم، بانگی دایکمم دەکرد:

- دایە! دایە!

- چ بووە؟

- کۆلکەدارەکان بوونەتە خۆڵەمێش، ئاخۆ دەتوانم هەندێک لەو خۆڵەمێشە بخەمە نێو بوتڵێکەوە؟

- خولەکێک ڕاوەستە!

دەچوو لە گەنجینە بوتڵێکی بەتاڵی دێنا، دوو سێ کەوچک خۆڵەمێشی تێ دەکرد، سەری بوتڵەکەی دەگرت و دەیدا بە من. "جا ئێستا برۆ!'

بە پەلە ڕام دەکردە کۆڵان بۆ ئەوەی بچمە لای منداڵەکانی تر، کە هەر یەکە و بە بوتڵێک خۆڵەمێشەوە چاوەڕێم بوون.

تەنانەت لە ئەدەبی کۆنیشماندا دوژمنانمان ناسووتێنین و نایانکەینە خۆڵەمێش، بەڵام دیکتاتۆرەکانی فارس بە شێوەیەکی دیکە هەڵسوکەوتیان دەکرد. ئەوان قارەمانەکانی گەلیان بۆ هەمیشە بە دارەوە هەڵدەواسی، خۆر جێگەی ئاگری دەگرتەوە. **حەسەنەک** ئا بەم جۆرە بووە خۆڵەمێش. لە کتێبی **شێخ ئەبولفەزلی بیهەقی** ئەم چیرۆکەم خوێندووەتەوە.

"**حەسەنەک**، وەزیری گەورە، بە سواری ئەسپێکی لەڕ و لاواز دەبرا بۆ بەردەم پەتی سێدارە، ئەو هەرگیز لە

ژیانیدا سواری ئەسپێکی وەها نەبوو. جەللادەکان دەستی **حەسەنەک**ی وەزیریان لە پشتەوە بەستبووەوە.

سوڵتان فەرمانی دا: 'بەردبارانی بکەن!'

بەڵام کەس دەستی بۆ بەرد نەبرد.

سوڵتان گوڕاندی: 'هەڵیواسن!'

جەللادەکان **حەسەنەک**یان هەڵواسی.

سوڵتان بە دەنگێکی بەرز گوتی: 'دەبێ بۆ هەتاهەتایە بە دارەوە هەڵبواسرێ!'

**حەسەنەک** بۆ ماوەی حەوت ساڵ بە دارەوە هەڵواسرا، خۆری مەملەکەتی فارس سووتاندی و بای ڕۆژئاوا خۆڵەمێشەکەی لەگەڵ خۆیدا برد."

لە مەڕاسیمی سووتاندنەکەدا شتێک کەم بوو، بەڵام ئەو شتە چیی بوو؟ نازانم. لە ماوەی سووتاندنی جەستەیەکدا ڕاستی و خەیاڵ ئاوێتەی یەک دەبن، لێک هەڵاواردنیان ئەستەمە. کەچی ناشتن و بەخاکسپاردن ڕاستییەکی پەتییە، پرۆسەیەکی تەواوە. تەرمەکە بە زێوان دەسپێرێ، زێوان دەیخاتە نێو گۆڕێکەوە و بەردهەڵکەن لە سەر کێلەکەی ناو و ڕێکەوتێک هەڵدەکۆڵێ.

هەرچی بێ منیش بەشداری مەڕاسیمی سووتاندن بووم.

تابووتەکە هەتا زۆپای جەستە سووتاندن برا.

لەوێوە ئەرکی من تەواو بوو، هۆکارێک نەمابوو چاوەڕێ بکەم.

"ماڵئاوا خاتوون!"

دەستی بەرەو لای من ڕاداشت.

- سوپاستان دەکەم.
- سوپاسی پێ ناوێ. بە ئەرکی خۆمی دەزانم.
دەستیم گووشی و هاتمە دەرێ.
هەستم کرد دەیەوێ شتێکی تر بڵێ، یان ڕەنگە چاوەڕێ بووبێ من پرسیارێکی دیکەی لێ بکەم. بەڵام لەو ساتەوەی وا **ڕۆنی** بەرەو زۆپاکە برا، چیتر نەمتوانی لەگەڵیدا قسە بکەم. ئەوەی ڕاستی بێ دەمویست بڵێم: "ئاخۆ دەکرێ جارێکی دیکە و لە شوێنێکی تر چاوم پێتان بکەوێ؟"
لە ڕاستیدا دەبوایە دەرگەکەم کراوە هێشتباوە هەتا ئەویش دەهاتە دەرێ، دەبوایە تا بەردەم ئۆتۆمبێلەکەی بە قەراغ دارەکاندا شان بە شانی ئەو ڕۆیشتبام. بابەت بۆ قسەکردن کەم نەبوون، بەڵام وام نەکرد. خێرا بەرەو ماڵ بوومەوە. بەر لەوەی بتوانم لەگەڵ ژنێک لە ژێر دارەکاندا باس و خواسێک دەست پێ بکەم، دەبوایە لەگەڵ ئەم وشە بێگانانە ڕاهاتبام. لە لایەکی ترەوە حەزم نەدەکرد داوا لە ژنان بکەم بەرەو لام بێن. گەرچی نا، جارێک، تەنیا جارێک. ئەو ژنەی کە پێویستە بێ، خۆی دێت. ئەگەر بۆ جاری دووەم بانگی بکەی، ئەوا دوور دەکەوێتەوە. بەڵام پێویستە بێ. لە خۆڕا نییە کە ناوەکەی لە تەنیشت ناوی من لە سەر کارت پۆستاڵەکە نووسراوە، ڕۆژێک دێت و لە دەرگە دەدا؛ لە دەرگەی ماڵی **بولفەزل**.

## ١٩

له دەرگە دەدەن.

پێم وا بێ ڕۆژێکی پاییزی بوو، چەند هەفتەیەک پاش مەڕاسیمی سووتاندنی تەرمەکە. دەرگەکەم کردەوە. ژنێک بوو، ژنێکی بەساڵاچوو جانتایەکی پێ بوو و لە بەر دەرگە ڕاوەستابوو. لەچکەیەکی لە سەری هاڵاندبوو، لە دەرەوە بایەکی تووش و دژوار دەهات.

"ئێوە ئەو پیاوەن کە..."

هاووڵاتییەکی خۆم بوو. کاغەزێکی پیشان دام، ناوی من لە سەر کاغەزەکە نووسرابوو.

- فەرموون خاتوون.

- ئێوە ئەو پیاوەن کە دوایین جار کوڕەکەی منتان بینی؟

- کوڕەکەتان خاتوون؟ کام کوڕ؟

کتوپڕ زانیم باسی چ دەکا، کورسییەکم بۆ لە نێوەڕاستی ژوورەکە دانا.

"فەرموون خاتوون."

میوان نەبوو، بۆ شتێکی تر هاتبوو، شتێکی گرنگ. هاتبوو کۆمەڵێک پرسیارم لێ بکا، ناوی من لە سەر

کاغەزەکەی نووسرابوو. کەواتە نەدەبوایە فەرمووی بکەم لە سەر قەنەفە دابنیشی، بەڵکو دەبوایە لە سەر کورسییەک دابنیشی.

ڕاشکاوانە گوتم: "فەرموون لێرە دانیشن."

جانتاکەی لە تەنیشت کورسییەکە دانا و دانیشت، کورسییەکیشم بۆ خۆم لە بەرامبەر وی دانا.

- خاتوون، چۆن ناونیشانی منتان دۆزیوەتەوە؟

- لە ڕێگەی هاوولاتییەکانمەوە، هەروەها پۆلیسیش یارمەتی داوم. من دوو کاتژمێرە هاتووم. دوو پیاوی گەنج لە فرۆکەخانە پێشوازییان لێ کردم، ئەوان هەتا بەر دەرگەی ئێوەیان هێنام و ئێستا نا تاوێکی تر بە دوومدا دێن.

وێنەیەکی لە ساکە ڕەشەکەی دەرهێنا.

- دەڵێن تەرمی کوڕەکەمت بینیوە، ڕاستە؟

- تەرمی کوڕەکەتان؟

- بڕوا ناکەم کوڕەکەم... کە شەمەندەفەرێک... چۆن بڵێم... کە لە سەر ڕێگەی ئاسن... پێم بڵێن، دە پێم بڵێن درۆیە. ئێمە، بنەماڵەکەی، براکانی، خوشکەکانی، مام و پوور و خاڵەکانی، قەت ناتوانین بڕوا بکەین. جوان سەیری ئەم وێنەیە بکەن. تکاتان لێ دەکەم، پێم بڵێن تەرمەکە هیی کەسێکی تر بووە.

وێنەکەم لێ وەرگرت و بە وردی سەرنجم دا، ڕێک ئەو وێنەیە بوو کە بە پەساپۆرتەکەوە بوو. سەیری ژنەکەم کرد، چاوەکانی ماندوو و تەژی بوون لە

چـاوەڕوانی. ئەم ژنەم دەناسـیيەوە کە بە وێـنەیەکەوە هـاتبووە لام، دەشـمزانی ئەم ژنە دەیەوێ چ شـتێکم لـێ ببیستێ.
جانتاکە بەوپەڕی سەبرەوە چاوەڕێ بوو، هەرچی بێ ناکرێ ژنێکی بەساڵاچوو بە دەستی بەتاڵ بگێڕێتەوە.
تەرمێـک لە نێـو جانتاکەیـدا جێـی نەدەبـووەوە. بەڵام چیرۆکێـک، بـۆ نـا؛ ئەوە هەمـان ئەو شـتە بـوو چـاوەڕێ بوو لە زاری من بیبیستێ.
دەمزانی براکـان، خوشـکەکان، مـام و پـوور و خاڵەکـان نە چـاوەڕوانی تەرم بـوون و نە گـۆڕ، بەڵام چیرۆکێکـی گونجاو بۆچی.
لێم پرسی:
- کوڕەکەتـان نـاوی **سـوبحان** ئیبنـی **سـوبحان** ئیبنـی **سوبحان**ە؟
- بەڵێ، پیاوە گەنجەکە؛ ناوی **سوبحان** ئیبنی **سوبحان** ئیبنی **سوبحان**ە.
- مەگرین خاتوون. با شـتێکتان پێ بڵێم، دەبێ دان بە شــتێکدا بنـێم، فرمێســکەکانتان بســڕنەوە خـــاتوون. پەســـاپۆرتەکە ســـاختە بـــوو، زانیارییەکـــانی نێـــو پەساپۆرتەکەش هەروا. ئەمە با لە نێوان خۆماندا بێ.
بە واقوڕمانەوە پرسـی:
- دەتانەوێ بڵێن چی؟
- ببـوورن. ئێسـتا هەموویتـان بـۆ دەگێـڕمەوە، هێشـتا هەنـــدێک گومـــانم هەیە. تەرمـــی ئەو هاووڵاتییـــانەی

نەناسراو ماونەتەوە، هێندە زۆرن لە ژمار نایەن. لێم تێبگەن، دەبێ کەسێک بیانناسێتەوە.
- ئەی کوڕەکەی من؟ ئەو تەرمە هیی کوڕەکەی من بوو یان نا؟
- لە پرسیارەکەتان تێدەگەم، بەڵام نازانم چۆنتان بۆ شی بکەمەوە. دەزانن خاتوون، پەساپۆرتەکە کێشەی نەبوو، بەڵام تەرمەکە هیی ئەو نەبوو.
- تێناگەم. سەرەتا گوتتان پەساپۆرتەکە ساختە بوو، کەچی ئێستا دەڵێن پەساپۆرتەکە ڕاست بوو، بەڵام تەرمەکە هیی وی نەبوو. لە بەرتان دەپاڕێمەوە ئەمەم بۆ شی بکەنەوە! چی ساختە بوو؟ پێم بڵێ چی ڕاست بوو؟
- ئێستا پێتان دەڵێم، بەردەوام گومانم هەن. سەیر کەن! ئێوە ژنێکن سارد و گەرمی ڕۆژگارتان چێشتووە، ئەمن ئەوە بۆ چەندین ساڵ دەچێ خەریکی هەڵاتهەڵاتم. ژمارەیەکی زۆر هاووڵاتی مە بێ ناسنامە بە گۆشە و قوژبنی دونیادا دەگەڕێن، گەلێک تەرم بە پەساپۆرتی تەزویر بە خاک سپێردراون. بە ڕاستی دوودڵ و ڕاڕام. کەنگێ، لە کوێ گوتوومە تەرمەکە هیی کوڕی ئێوە بووە؟ ئەوەی ڕاستی بێ... چۆنتان بۆ باس بکەم، ناتوانم پێتان بڵێم، مافی ئەوەم نییە خاتوون.
هۆن هۆن گریا و بەدەم هەنیسکدانەوە گوتی:
- لە خۆڕا ملم نایە بەر ئەو ئەم سەفەرە دوورودرێژە. کەس نییە پێم بڵێ چ ڕووی داوە!

- من دەتوانم پێت بڵێم، دەتوانم ڕاشکاوانە بۆت باس بکەم چ قەوماوە. خاتوون! من ژمارەیەکی زۆر گۆڕی ون دەناسم، دەتوانم گۆڕەکەت پیشان بدەم و بڵێم: 'ئەمەیە. کوڕەکەت ئا لەو گۆڕەدا نێژراوە.' بەڵام هەروا سووک و سانا نییە، ناتوانم وا بە ئاسانی پشتڕاستی بکەمەوە. جا ئەگەر من نەتوانم پشتڕاستی بکەمەوە، کەس ناتوانێ ئەو کارە بکا. جا با پێتان بڵێم، من چەندین و چەندین ساڵە خەریکی هەڵاتهەڵاتم. ژمارەیەکی زۆر هاووڵاتی هەن بێ ناسنامە کون و کەلەبەرەکانی دونیا دەپێون. کێ چ دەزانێ خاتوون، ڕەنگە کوڕەکەی ئێوەش بەشێک بێ لەو مرۆڤانە. خاتوون، ئەوە دەبێ لە نێوان خۆماندا بمێنێتەوە. من، کوڕەکەتان و ئەوانی تر، بەگشتی ئێمە سزا دراوین. ئەوەی پشتی لە نیشتمانی خۆی کردبێ دەبێ باجێکی زۆر قورس بدا. ئاخۆ ئێوە سەبارەت بەو هاووڵاتییە هیچتان بیستووە؟ ئەو پیاوەی جگە لە فڕۆکەخانە، مافی نییە لە شوێنێکی تر بژی؟ ئەو مرۆڤەی وا هیچ وڵاتێک نایەوێ ناسنامەی پێ بدا. دەبینن، دیسان مرۆڤێکی بێ ناسنامە.

فرمێسکەکانی سڕینەوە.

لێم پرسی: "ئاخۆ بەسەرهاتی ئیسرائیلییەکانت بیستووە؟ جولەکە وێڵگەرد و سەرگەردانەکان، ئەو جولەکانەی تا هەتایە بە سەرگەردانی مەحکووم بوون؟ بگەڕێنەوە خاتوو، دەرگەکەتان بە نیوەکراوەیی

بهێڵنەوە. کێ چ دەزانێ. دواجار ئیسرائیلی گەڕانەوە بۆ ماڵێ."

دەستی بەرەو جانتاکەی برد، بۆ ساتێک بەدەم تێڕامانەوە دەسکەکەی گرت. پاشان لەناکاو هەستایە سەر پێ، جانتاکەی هەڵگرت و گوتی:

– دەڕۆم.

– کوپێک قاوە، پیاڵەیەک چا ناخۆنەوە خاتوون؟ پشوو بدەن، ماندوو و شەکەتن.

دوو هاوولاتی لە پشت پەنجەرەوە بەدیار کەوتن.

گوتی:

– ئەوە هاتن، خۆیانن.

– ئاخۆ دەتانەوێ بچین و گۆڕی ئەو نەناسراوە ببینین؟ داوای لێبوردنتان لێ دەکەم، هەرچی بێ ناوی کوڕەکەتان لە سەر کێلەکە هەڵکەنراوە.

نێوچەوانمی ماچ کرد.

چووینە دەرێ.

بەیانیی ڕۆژی دواتر لە ماڵەوە بەتەنیا بووم، کەسێک هەمدیس لە دەرگەی دا. لە پەنجەرەڕا سەیری دەرەوەم کرد، هاوسەری پێشووی ڕۆنێ لە پشت دەرگەکە بوو. بە ئەسپایی چووم دەرگەکەم لێ کردەوە.

– هەلەو! ئاخۆ بێزارتان ناکەم؟

– ئەوە چ قسەیەکە؟ بە پێچەوانەوە. فەرموون خاتوون! زەرفێکی بچووکی پێ دام، کە لە ڕۆژنامەیەکەوە پێچرابوو.

- فەرموو بۆ ئێوەیە.
- ئەمە چییە؟
- کە کەلوپەلەکانی ڕۆنیم کۆ دەکردنەوە، یەک دوو شتم بۆ ئێوە دانا. وەک بیرەوەرییەک لە لایەن ڕۆنیوە.
زەرفەکەم کردەوە.
"تابلۆیەک! چ سوپرایزێکی جوانە! لە چاکەی خۆتانە. زۆر سوپاس."
هەروەها چەند وێنەیەک هەبوون، ئەو وێنانەی ڕۆنی خۆی گرتبوونی.
کورسییەکم لە نێوەڕاستی ژوورەکە دانا و گوتم: "تکاتان لێ دەکەم دابنیشن."
ساتێک لە نێوان قەنەفەکە و کورسییەکەدا دڕدۆنگ ما، پاشان لە سەر کورسییەکە دانیشت. کورسییەکی ترم هەڵگرت و لە بەرامبەری دانیشتم.
گوتی:
- لە مەڕاسیمی سووتاندنەکەدا حەزم دەکرد زیاتر قسەتان لەگەڵ بکەم، بەڵام ئێوە زۆر زوو ڕۆیشتن.
- ڕاستە. پێشتر هەرگیز بەشداری مەڕاسیمی سووتاندن نەبووم. ئەو ساتەی وا کرێکارەکە تابووتەکەی بەرەو نێو ئاگردانەکە پاڵ پێوە نا، هێز و توانای ئەوەم تێدا نەما بە سانایی هەستی خۆم بە هۆڵەندی دەرببڕم. ئاخۆ لە مەبەستم تێدەگەن؟ ڕۆنی یەکەم جیرانی من بوو، پیاوێک کە متمانەم پێی هەبوو. لە وڵاتی خۆم بە هیچ شێوەیەک پەیوەندیم لەگەڵ

جیرانەکانمدا نەبوو، لە ڕژێمێکی دیکتاتۆردا بڕوا بە هیچ کەس نـاکەی. مەحـاڵە بتـوانی دەردی دڵ بـۆ کەسـێک هەڵڕێـژی، سـەبارەت بە هەڵبژاردنـی وشـەکان دەبـێ بەردەوام بە پارێزەوە هەڵسوکەوت بکەی، وەلێ لەگەڵ ڕۆنێ هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد. ئاخۆ لە مەبەستم تێدەگەن؟

لە پڕێکدا بێدەنگ بووم، من نەدەبوایە چیتر قسە بکەم. بە نۆرەش بێ نۆرەی هاوسەری پێشووی ڕۆنێ بوو قسە بکا، بۆ ئەم مەبەستە هاتبوو من ببینێ. ئەم تابلۆیە و وێنەکـان تەنیـا بیـانوویەک بـوون و هیچـی تـر. هـاتبوو چـاوی بە مـن بـکەوێ تـاکو سەرگوزەشـتەی خـۆیم بـۆ بگێـڕێتەوە، بـۆیە بێـدەنگ بـووم. بەڵام ئەو هیچی نەگوت. ساتێک بێدەنگی بەسەر ژوورەکەدا زاڵ بوو، تابلۆکەم هەڵگرتەوە.

"سـوپاس. هەمیشـە حەزم دەکـرد تـابلۆیەکی لەم شێوەیەم هەبێ. شوێنێکی باشم بۆ دۆزیوەتەوە."

بیرم لەوە دەکردەوە ئێستا نا ئێستا وە قسە دێ، لێ هیچ کاردانەوەیەکی پیشـان نەدا. منیش ئیتر هیچم بۆ گوتن پێ نەبوو. "حەز دەکەن قاوەیەک ساز بکەم؟"

بە دەنگێکـی نەرم هـاتە گـۆ: "لە مەڕاسـیمی سووتاندنەکەدا داواتان لێ کردم بە وردی بۆتان باس بکەم چ قەومـاوە، بەڵام قسەکردن لەم بـارەوە ئاسـان نییە. نازانم چۆن باسی ئەو شتە بکەم کە ڕووی داوە. ئەوەی ڕاستی بێ تەقینەوەیەک بوو."

بە خۆمم گوت: "تەقینەوە؟ تەقینەوەی چی؟ دەبێ مەبەستی چی بێ؟"
ڕەنگە وشەی "تەقینەوە" واتایەکی دیکەی هەبێ و من لێی بێئاگا بم. بۆ من "تەقینەوە" دێتە واتای شکانی لەناکاو و پەرشوبڵاوبوون، وەکو بۆمبێک. چەشنی سەرجەم ئەو بۆمبانەی بە درێژایی ساڵانی جەنگ لە نیشتمانەکەم تەقینەوە.
- مەبەستتان لە وشەی "تەقینەوە" چییە؟
- ئەها، باسی شتێکی تر دەکەم. باسی **ڕۆنی** دەکەم، باسی خۆم، باسی پەیوەندیی نێوانمان.
- پەیوەندی؟ ئەوەندەی من بزانم ئێوە بە شێوەیەکی فەرمی لەگەڵ **ڕۆنی** زەماوەندتان کردبوو.
- بەڵێ، بێگومان، زۆر باشیش پێکەوە هەڵمان دەکرد. **ڕۆنی** نیگارکێش و پەیکەرساز بوو، هەروەها پیاوێکی دڵخۆش بوو. منداڵێکمان بوو، کچێک.
- وایە، ئاگەدارم. **ڕۆنی** پێی گوتبووم، جارجارە باسی ئێوەی بۆ دەکردم. پێم وایە بەردەوام تاسەی دەکردن، حەزی دەکرد لە لاتان بێ، بەڵام بۆم دەرکەوتبوو کە ناکرێ، کە جێبەجێ نابێ. ئێوە پێکەوە بەختەوەر نەبوون، وایە؟
- نەخێر، یانی بەڵێ. ئێمە بەختەوەر نەبووین، بەڵام خراپ نەبوو. وەک هەموو کەسانی تر. **ڕۆنی** دەیکرد و نەیدەکرد کاری بۆ نەدەدۆزرایەوە، بەردەوام کاری کاتی. شتێک لەودا گرفتی هەبوو، بەڵام نەمزانی ئەو

شته چییه. زەماوەندی من لەگەڵ **ڕۆنی** وەک هەڵبوون و کوژانەوەی زۆپایەک وا بوو؛ سەرەتا گڕەکان شین بوون، لەناکاو بڵێسەی زەرد بەدیار کەوتن و دواجار ئاگرەکە بوو بە دووکەڵ.

- تێدەگەم، دەزانم دەڵێن چی. ئەستەمە. نازانم بە چ وشەیەک دەری ببڕم، زۆر باش دەتوانم بارودۆخەکە وێنا بکەم. ئەستەمە. دەبێ زۆر سەخت و دژوار بووبێ.

- لە پەنا من دەخەوت، بەڵام چیتر **ڕۆنی** نەبوو، بەڵکو بێگانەیەک بوو. '**ڕۆنی** چیت بەسەر هاتووە؟ ئاخۆ کێشەیەک ڕووی داوە؟' دەیگوت: 'نەخێر **ئانێک**، تەنیا هەست دەکەم باش نیم و هیچی تر.' لە تەنیشت من وەک تەرمێک ڕادەکشا، ساردوسڕ.

هەستم بە ئاسوودەیی نەدەکرد. بابەتێکی هەستیار بوو، ڕانەهاتبووم لەم بارەوە لەگەڵ ژنان دەردی دڵ بکەم. ئەگەر ئەو چیرۆکی خۆی بۆ دەگێڕامەوە، مافی منیش بوو بە نۆرەی خۆم پرسیاری لێ بکەم.

تەرمێک لە تەنیشت ژنێک، لە تەنیشت ژنەکەی. **ڕۆنی** چیتر نەیدەتوانی ژنەکەی نەوازش بکا، چیتر نەیدەتوانی مەمکەکانی بگووشێ، دەستەکانی ئیتر بەرەو نەرمەی ڕانەکانی نەدەچوون.

- ئەی پاشان... پاشان... چ ڕووی دا؟

- چیتر نەیدەتوانی لە تەنیشت من بخەوێ. 'هەوڵ بدە **ڕۆنی**! دەستەکانت لە سەر شانم دابنێ!'

لێم نەپرسی ڕۆنێ داواکارییەکەی جێبەجێ کرد یان نا.
ساتێک بێدەنگ بوو، چاوەڕێ بووم.
بەردەوام بوو:
- دەستەکانی لە سەر سینگم دانا. ئاخ! چەندە سارد بوون! دەستەکانی وەک پارچە سەهۆڵێک وا بوون.
لە وڵاتەکەم هەرگیز ژنێک سەبارەت بەم بابەتانە قسەی بۆ نەکردبووم.
ئەوسا گوتی:
- ئەوکات تەقییەوە.
- چی تەقییەوە؟
- ئەم هەستە، هەستی دوورەپەرێزبوون. جەستەم چیتر ئەوی نەدەویست.
- تێدەگەم. بەڵام لە گۆڕینی کتوپڕی جەستەی ناگەم.
- منیش هەروا. بەتایبەت سەرەتا هیچ تێنەدەگەیشتم، بەس دەبوایە چاوەڕێ بم بەو هیوایەی هەموو شتێک ڕێڕەوی خۆی بگرێتەوە بەر. بەڵام ئیتر هیچ پەیوەندییەکمان پێکەوە نەمابووەوە. یەکێک لە ئێمە دەبوایە لەو ماڵە بڕوا.
- جا ئێوە ماڵەکەتان جێهێشت؟
- نەخێر، من ئیتر نەمدەتوانی بەم جۆرە تاکوتەنیا وازی لێ بێنم. ڕاستت بوێ ئەو نەخۆش بوو. نا، ناتوانم بڵێم نەخۆش... ئێستاش نازانم لە جێی چ دەستەواژەیەک بەکار بێنم.

- لەگەڵ ئەوەشدا بەختتان هەیە لە وڵاتێکی ڕۆژئاواییدا دەژین، لە خۆم دەپرسم ئەگەر ژنێکی هاووڵاتیم لەگەڵ کێشەیەکی وەهادا دەستەویەخە بوایە، چیی دەکرد.
- ڕەنگە شتەکان لە وڵاتی ئێوە بە جۆرێکی تر چووبانە پێش و هیچ نەهاتبا گۆڕێ. من چارەسەرییەکم پێ شک نەدەهات، تەنیا دەبوایە چاوەڕێ بم گۆڕانکارییەکە ڕاشکاوانە خۆی بنوێنێ، لە لایەکی ترەوە دەبوایە چاوەڕێ بم کچەکەمان هەندێک گەورەتر بێ.
- ئەی ئەم هەستە... چۆن بڵێم... چۆن توانیتان خۆتان لەگەڵ ئەم دوورەپەرێزگرتنە ڕابێنن؟
- ئاسان بوو. شێوازێکی درێژەدان بە ژیانمان دۆزییەوە؛ من ژووری نووستنم جێ هێشت و چووم لە لای کچەکەم خەوتم. سەرەتا سانا نەبوو، بەڵام هێدی هێدی پێی ڕاهاتین. پاشان هەموو شتێک ڕوون و ئاشکرا بوو، ڕۆنێ چیتر پێویستی بە ژن نەبوو. بەدوای پیاوێکدا گەڕا و پێی گوتم گرفتێک نابینێ ئەگەر بێت و بە دوای مێردێکی تردا بگەڕێم. بەڵام هەروا سووک و سانا نەبوو، کات پێویست بوو. سەرەتا دەبوایە بەم بیرۆکەیە ڕابێم، پاشان بە پارێزەوە بەدوای مێردێکی نوێدا گەڕام. بە ڕواڵەت ئاسانە، بەڵام چیتر مێردێکی تر نادۆزیتەوە. پیاوی تر دەدۆزیتەوە، گەلێک پیاوی تر؛ هەموویان بۆ ماوەیەکی کاتی.
- بۆ ڕۆنێش هەر وا بوو پێم وابێ.

- بەڵێ، ئەویش بۆ ماوەیەکی کاتی کۆمەڵێک پیاوی دۆزینەو. هەردووکیشمان ڕازی بووین. تەنانەت باسی ئەو پیاوانەمان دەکرد لە دەرەوەی ماڵ تووشیان دەبووین. هەموو شتێک لە ماڵەوە مەنگ و ئارام بوو. کچەکەشمان لە پەنامان گەورە دەبوو، بەڵام کتوپڕ ڕۆنی هاودەمێکی درێژخایەنی دۆزییەوە.

- ئەها! ناکا مەبەستتان ئەو پیاوە کورتەباڵایە بێ؟ ئەو پیاوەی گوارەی لە گوێدا بوون؟

- خۆیەتی. دەبێ بینیبێتتان. کاتێک ئێوە لەگەڵ بنەماڵەکەتان هاتنە ئێرە، ئەو لێرە دەژیا.

- پێم وایە دەبێ دوای ئەمە بە یەکجاری ئەم ماڵەتان جێ هێشتبێ.

- نەخێر، یەکسەر نەڕۆیشتم. سەرەتا ڕۆنی دوو سێ شەو لە هەفتەدا لە ماڵی وی دەمایەوە، بە هیچ شێوەیەک بەمە جاڕز نەدەبووم، پەیوەندیی بە خۆیەوە هەبوو. پاشان هاوڕێکەی جارناجارێ دەهاتە ماڵی ئێمە، تەنانەت بەرگەی ئەمەشم گرت. بەڵام شەوێک کە دەگەڕامەوە ماڵێ، بینیم قەرەوێڵەیەکی گەورە لە بەردەم پەنجەرە دانراوە. ئێ! ئەم جارەیان چ بووە! هاوڕێکەی بار و بنەی لە ماڵی ئێمە داکوتا. من ڕێگەیەکی دیکەم لە پێش نەبوو، دەبوایە لە ماڵێ بڕۆم. کچەکەمان لە کن ڕۆنی مایەوە، من پرێسکەم پێچایەوە.

بۆ بەیانیی ڕۆژی دواتر تێگەیشتم بۆچی ژنەکەی **ڕۆنی** هاتۆتە دیدەنیم، ئەگەر ئەو چیرۆکی **ڕۆنیێ** لە مێشکی مندا سەرلەنوێ بونیاد نەنابایەوە، کێ ئەو کارەی کردبا؟

ئەو هەروەها هاتبوو تاکو لاپەڕە سپییەکانی نێو چیرۆکە کۆنە فارسییەکان پڕ بکاتەوە، کە دەمزانین.

لە ئەدەبی کۆنی وڵاتەکەی مندا، دەگمەن نین ئەو چیرۆکانەی باسی خۆشەویستیی پیاوێک بۆ پیاوێکی دی دەکەن. لە چیرۆکی وادا هەرگیز بوونی ژنێک لە گۆڕێدا نییە، بەردەوام باسی پیاوێک دەکرێ. تەنانەت باسی زانایەک بە ڕیشێکی خۆڵەمێشییەوە کە چیتر ناتوانێ بەسەر خۆیدا زاڵ بێ. کتوپڕ، جلەکانی دادەنێ و بە ڕووت و قووتی خۆ بە ماڵێکی تردا دەکا. چیرۆکەکە باس لەوە ناکا بەسەرهاتەکە چلۆن کۆتایی دێ.

هیچ شتێک لە سەر هاوسەری زاناکە نەگوتراوە، هەروەها ئەوەش نازانرێ ئاخۆ پیاوەکە وەک قالبە سەهۆڵێک لە تەنیشت ژنەکەی ڕاکشاوە یان لە مەمکەکانی هەڵبەزیوەتەوە. لە هیچ کوێ باسی ئەوە نەکراوە ڕانە گەرمەکانی ژنە بەکەفوکوڵەکە هەستی بە بوونی دەستی مێردەکەی لە سەر خۆی کردبێ.

هەروەها لە چیرۆکەکەدا ناخوێنیتەوە کە دەستە ساردەکانی زاناکە وەک دەستەکانی مردوویەک لە سەر ڕانی ژنەکە قورسایی بکا. هاوسەری پێشووی **ڕۆنی** هات، شتێکی گێڕایەوە کە پێویستم پێی بوو و

ڕۆیشتەوە. کتومت وەک دایکی **سوبحان** ئیبنی **سوبحان** ئیبنی **سوبحان** کە هات، تەوێڵی ماچ کردم و ڕۆیشت. بەڵام ژنی پێشووی **ڕۆنی** تەوێڵمی ماچ نەکرد. ڕەنگە دەبوایە ئەو کاتەی وا گوتی **ڕۆنی** چیتر ئەوی نەدەویست، تەوێڵیم ماچ کردبا. گەمژەیی، گەمژەییەک بوو لە لایەن منەوە.

## ٢٠

ئانێک هاتبوو بمبینێ تاکو خاڵی کۆتایی بۆ چیرۆکی ژیانی ڕۆنێ دابنێ. له ڕوانگه‌ی ئه‌وه‌وه ونبوونی ده‌هاته واتای کۆتایی چیرۆکه‌که‌ی. خۆیشی ڕۆیشت له شارێکی تر سه‌قامگیر بوو بۆ ئه‌وه‌ی له ژیانی نوێدا سێبه‌ری ڕۆنێی به‌سه‌ره‌وه نه‌بێ.

به‌ڵام ناکرێ خاڵی کۆتایی بۆ چیرۆکێک دابنێی، چیرۆکه‌کان په‌یڕه‌وی له یاساکانی خۆیان ده‌که‌ن؛ بۆ که‌سێک که بیه‌وێ ڕه‌وتی به‌سه‌رهاته‌که‌یان بگۆڕێ، مل دانانه‌وێنن. چیرۆکێک یان ئه‌وه‌تا خامۆش ده‌بێ، یان بۆ هه‌تاهه‌تایه ده‌ژی.

من توانای ئه‌وه‌م نه‌بوو شتێک له ژیانی ڕۆنێدا بکه‌م و نه‌مده‌توانی چیرۆکه‌که‌ی له‌بیر بکه‌م. چۆن ده‌متوانی چاوه‌کانم بنووقێنم و ماڵه چۆڵه‌که‌ی دیوار به دیواری خۆمان نه‌بینم؟ چۆن ده‌متوانی گوێچکه‌کانم بئاخنم بۆ ئه‌وه‌ی چیتر گوێم له باسوخواسی ڕۆنێ نه‌بێ؟ چۆن ده‌متوانی ده‌رگه‌که گاڵه ده‌م و ڕێگه نه‌ده‌م ئانێک بمبینێ؟ هه‌موو شتێک له ده‌ره‌وه‌ی ویستی خۆم ڕووی

دا. چۆن دەمتوانی بەردەوام پرسیاری ئەوە لە خۆم نەکەم کە جیرانی داهاتوومان کێ دەبێ؟

ئەو کاتەی وا تەرمی ڕۆنی لە نێو ئاگرەکەدا ون بوو، ڕۆنی ون بوو، بەڵام چیرۆکەکە نا. لە نێو بیرەوەرییەکانمدا جێگەی بۆ خۆی خۆش کرد. بەڵام چیرۆکەکە دەکەوتە سەر چ ڕەوتێکەوە، ئا لێرەدا هیچ بۆچوونێکم نەبوو.

نەمدەویست بێ هەست و خوست بم، دەمویست لە ڕەوتی ڕووداوەکاندا پشکم هەبێ. هەر بۆیەش بە دوای ئیشێکی تردا وێڵ بووم.

چیتر نەمدەتوانی لە کارگەی دروستکردنی قوتووی کۆنسێرودا درێژە بە کارکردن بدەم، بۆ من ئەو کارە تەواو ببوو. ئەگەر من ئاگر و شوێنم جێ هێشتبوو، بۆ ئەوە نەبوو قوتووی هۆڵەندییەکان کۆنتڕۆل بکەم. لە نێو سەرمدا ئاشێکی هۆڵەندی دەسووڕایەوە، کە لەو هەزاران قوتووە دروست کرابوو وا ڕۆژانە بە ڕیز بە بەر چاومدا تێدەپەڕین. چیتر نەمدەتوانی قوتووە زیانوێکەوتووەکان لەوانی تر هەڵاوێرم، ئەوان هاوکات لەگەڵ قوتووە ساغەکان دەهاتنە دەرێ و لە زارکی ئامێرەکەدا گیریان دەکرد. هەموو جارێ ناچار دەبووم ڕیزەکە ڕابگرم، ئامێرەکە بوەستێنم و بە بێزارییەوە قوتووە خراپەکان فڕێ بدەم. ئەوسا کرێکارەکان دەورەیان ئابلۆقە دەدام.

یەکێک لەوان دەیگوت: "دەبینن، دیسان دەستی پێ کردەوە."
یەکێکی تر دەیگوت:
- من پێم گوت، ئەو بۆ ئەم کارە دروست نەکراوە.
- وازی لێ بێنە! زارکی ئامێرەکە دەشکێنی.
- نەخێر، تەنانەت وشەیەکی هۆڵەندی تێناگا. کێ لە سەر ئەم کارە دایمەزراندووە؟ ئەم بێگانانە ناتوانن کار بەم ئامێرە نوێیانە بکەن.
پاشان سەرۆکی کارگەکە دەهات و دەیگوڕاند:
"هەر کەسە و بچێتە سەر کارەکەی خۆی! ئەوە خەوتووی چیت؟ خەیاڵت بۆ کوێ فڕیوە؟"
ئەوەندەی لە دەستم هاتبا هەوڵم دەدا باش کارەکان ڕاپەڕێنم، بەڵام نەدەکرا. ئەگەریش نەکرێ شتێکت لە دەست نایە. بۆ من ئەوە کار نەبوو، بەڵکو جۆرێک سزا بوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵم دەدا بە هەر شێوەیەک بووە ڕیزی قوتووە خراپەکان هەڵاوێرم. بەڵام ئەمە بە پێچەوانەوە وەرسووڕا، تا وای لێهات ڕۆژێک خاوەنکارەکە پێی گوتم: "بڕۆ چاکەتەکەت هەڵگرە!"
چاکەتەکەم دەست دایە و لەگەڵ خاوەن کارەکەدا تا نووسینگەکەی چووم.
لەوێ گوتی: "نابێ پێت وابێ لە **هۆڵەندا** هەموو شتێک ئاسانە. ئەگەر نەتوانی کارێکی وا سانا ئەنجام بدەی، ئیتر هیوات بە چییە؟"
وەڵامم نەدایەوە.

"بۆچی هیچ نالێی؟ یان ڕەنگە پێت باش بێ بڕە پارەیەک بخرێتە حیسابەکەتەوە و لە ماڵەوە پاڵی بۆ بدەیتەوە؟ ئیتر ژیانێکی خۆش ڕابوێری! هیچ خەم و خەیاڵێکت نەبێ، پارەکە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیک بێتە نێو حیسابەکەتەوە. وا نییە؟"

نەمدەویست وەڵامی بدەمەوە، لەوە دەترسام نەتوانم بەسەر ڕق و تووڕەیی خۆمدا زاڵ بم. بە خۆمم گوت باشتر وایە بڕۆم، چاکەتەکەم داخست و چوومە دەرێ.

لە پشت سەرم، لە داڵانەکەوە گوێم لە دەنگی بوو: "چەند چەند بێ چاوەڕوویشە!" قسەکانی لە قورگمدا مانەوە. دەمویست وەڵامی بدەمەوە، بەڵام هیچ شتێک نەدەگۆڕدرا. لای پەنابەرێک خەیاڵ و ڕاستی تێکەڵ بە یەک دەبن، بگرە خەیاڵ زۆر لە ڕاستی سەختترە. من لە خەیاڵی خۆمدا دەگەڕامەوە بۆ لای خاوەنکارەکە، لە بەردەم مێزەکەی بە پێوە وەستابوو و خەریک بوو بە تەلەفۆن قسەی دەکرد. پەرم دەدایە مل و قایشی پانتۆڵەکەی، بە جووڵەیەک بەرزم دەکردەوە بۆ ژوور سەرم و دەمقیژاند: "پێت خۆشە چیت لێ بکەم؟ بتخەمە نێو دەریا یان نێو ئاگرەوە؟"

بە دەم پاڕانەوەوە دەیگووت: "بمخە نێو دەریاوە."

بە هۆی ئەوەی هۆڵەندی بوو، بێگومان دەیزانی مەلە بکا. بۆیە نەمدەخستە نێو دەریاوە، بەڵکو دەمخستە نێو ڕابردوومەوە.

پاشان دەگەڕامەوە ماڵێ.

نەمدەویست ڕۆژەکانم لە ماڵێ تێپەڕێنم و دەست لە سەر دەست دابنیشم. ئەگەر بێ جموجوڵ بین، پرۆسەی هەڵاتن بە قۆنەقۆن دەڕواتە پێش. بەردەوام هەوڵم دەدا بزانم هۆڵەندییەکان چ دەکەن.

بەر لەوەی بێمە **هۆڵەندا**، من خەڵکی ئێرەم نەدەناسی، سەبارەت بە **هۆڵەندا** هەندێک شتم بیستبوو و هیچی تر. لای ئێمە مریشکی هۆڵەندی بەناوبانگ بوو، کابانەکانی ماڵەوە ئەو مریشکانەیان نەدەویست. "دەبێ چەند مریشکەکە لە نێو مەنجەڵدا بهێڵمەوە تاکو دەکوڵێ؟"

لەگەڵ ئەوەشدا پاش ئەوەی مریشکەکە چەندین کاتژمێر لە سەر ئاگر دەمایەوە، مریشکێکی تا ڕادەیەک کوڵاویان بۆ دەهێنای.

هەروەها بەسەرهاتی پیاوە بچکۆلە بوێرەکەی هۆڵەندام بیستبوو؛ بە گوێرەی بەسەرهاتەکە، قامکی خستۆتە نێو کونێکی بەنداو و بەم جۆرە خەڵکی **هۆڵەندای** ڕزگار کردووە.

بەڵام کاتێک سنوورەکان دەبەزێنی، بەسەرهاتە درۆینەکان لە نێو مێشکتدا هەڵدەوەشێنەوە و چیرۆکی نوێ سەر هەڵدەدەن، پەی بە شتی نوێ دەبەی و لە میکانیزمەکانی تێدەگەی. بە هەڵکەوت نەبووە ئەگەر ویستوومە بزانم جەستەی هۆڵەندییەک چۆناوچۆنە.

نەمدەزانی تا چ ئەندازە دەتوانم پەی بەم شتە نوێیانە بەرم؛ بۆ ئەم مەبەستە دەبوایە چاوەڕێ بم، دەبوایە وەک ئەوانی تر بژیم و بەوە قایل بم بزانم چ ڕوو دەدا.

هاوسەرەکەم ئاسایی دەژیا، وەک خەڵکانی تر. بەیانیان کاتژمێر دە، بەردەوام دەچوو لە لای جیرانەکان قاوەی دەخواردەوە، بۆ ماوەی کاتژمێر و نیویک قسەوباسیان ئاڵوگۆڕ دەکرد. پاشان شان بە شانی یەک بە دوای منداڵەکانیاندا دەچوون بۆ خوێندنگە.

هەروەها کوڕەکەشم گەورە بوو، کتوپڕ تێگەیشتم زمانی دایکی بە شێوەزاری هۆڵەندی قسە دەکا. ئیتر بە هۆڵەندی دەینووسی و لەگەڵ منداڵانی تر دەچوو لە کتێبخانە کتێبی وەردەگرت.

من لەگەڵ زمانی هۆڵەندی لە ململانێدا بووم، بەڵام ئەوان پێشکەوتنی بەرچاویان بە خۆوە بینیبوو. شتێک لە بەردەم گەشەسەندنی من دەبووە ئاستەنگ؛ من بەردەوام لەگەڵ چیرۆکەکانی ناو سەرم و ماڵە چۆڵەکەی تەنیشتمدا دەژیام.

ئەوەی ڕاستی بێ جگە لەوەی بمەوێ وەک گشت خەڵکانی تر بژیم، هیچ چاوەڕوانییەکی ترم نەبوو. زۆر حەزم دەکرد فێری ئەوە بم لە سەر کاریزەکەی بەردەم ماڵەکەمان خلیسکێن بکەم، لە نێو جەرگەی ئەو هۆڵەندییانەی باش دەیانزانی ئەو کارە بکەن، هەستم و بکەومەوە. بەڵام نەدەبوو.

دەبوایە داوام لە کرێکاری سووتاندنی تەرمەکان کردبا ڕابردووی منیش بخاتە نێو کوورەکەوە و خۆڵەمێشەکەی بخاتە نێو ئینجانەیەکەوە، بۆ ئەوەی لە سەر ئاگردانە هۆڵەندییەکەی ماڵەکەمم دانابا.

جارجاره بیر دەکەمەوە: ئەگەر **ڕۆنی** جیرانی من نەبوایە، ئاخۆ وەها قووڵ بە گژ ڕابردوودا دەچووم؟
ئەگەر کەسێکی تر جگە لەو جیرانی من بوایە، گەلۆ تێڕوانینێکی جیاوازم نەدەبوو؟
لە خۆمم دەپرسی، تۆ بڵێی **ڕۆنی** بەرپرسیاری ئەوە نەبێ **ئەسغەر کەچەڵ** لە نێو ڕابردوومدا بە شێوەیەکی بازنەیی پاسکیل نەئاژوێ؟
ڕەنگە وا بێ. بە هۆی ئەوەی **ڕۆنی** لەگەڵ پیاواندا دەخەوت، بەشێک لە بیرەوەرییەکانی منی بووژاندەوە. شتێک کە کەسێکی تر نەیدەتوانی بیکا. ئەمەش پەیوەندیی بە **ئەسغەرە کەچەڵ**ەوە هەبوو، لەگەڵ ئەو کوڕیژگانەی هەوڵی دەدا بە تەڵەیانەوە بکا. ماڵە چۆڵەکە لە یاد و بیرەوەریی من نەدەچووە دەر، نەک لەبەر ئەوەی **ڕۆنی** تیایدا دەژیا، بەڵکو بە هۆی ئەوەی ماڵی چۆڵ بە لای منەوە سەمبۆلی هەڵاتن، دەستدرێژی و مەرگ بوو. ژمارەیەکی زۆر ماڵم پێ شک دەهات، کە بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر لە لایەن دانیشتوانیانەوە چۆڵ کرابوون.
بۆ نموونە ماڵەکەی **چینی**، ماڵی جیرانەکەمان سێ ساڵ پێش ئێستا.
شەو لە ژووری میوانان هەر وا ڕووناکی بەدی دەکرا، بەڵام کازیوەی بەیانیی ڕۆژی دواتر کە چوومە دەرەوە تاکو نانی تازە بکڕم، بینیم ماڵەکە چۆڵ کراوە. بە

هەڵەداوان چووومەوە ماڵێ و هاوارم کرد

- دایە! ئەوان ڕۆیشتوون! ماڵەکەیان چۆڵە!

- کێ ڕۆیشتووە؟

- بنەماڵەی **چینی**.

دایکم بە پەلە ڕایکردە دەرەوە. بە سەرسووڕمانەوە لە پەنجەرەکەڕا سەیری ناوەوەی کرد.

لەبەر خۆیەوە گوتی: "وایە. ڕۆیشتوون."

تێنەدەگەیشتم. چۆن دەکرا لە چاوترووکانێکدا ون بووبن؟

ڕاستە قەت هیچ شتێک بۆ منداڵان ناگێڕینەوە، پرسیارەکەش وەک ماڵێکی چۆڵی کلۆمکراو لە مێشکی مندا مایەوە. دواتر شتەکەم لەبیر چووەوە. ئەوەی ڕاستی بێ پرسیارەکەم لە نێو یادەوەرییەکانمدا خستبووە سووچێکەوە، تاکو سێ ساڵ دواتر سەرلەنوێ بیوروژێنمەوە.

بۆچی لەناکاو ماڵەکەیان چۆڵ کرد؟

چما هیچ شوێنەوارێکیان لە دوای خۆیان جێ نەهێشت؟

لەبەر چی هەڵاتن؟

لە چی دەترسان؟

ئێستا هەوڵم دەدا وەڵامێک بدۆزمەوە، بەڵام هیچ سەرەداوێکم بە دەستەوە نەبوو. لە نێو یادەوەرییەکانمدا بە دوای ئەو وشانەدا وێڵ دەبووم کە هیچ پەیوەندییەکیان بە یەکترەوە نەبوو، بەدوای

ڕستەی بچووکی لە بەر یەک هەڵوەشاوە، تاکو یەک بە دوای یەک ڕیزیان بکەم و بەم جۆرە چیرۆکی ماڵە چۆڵەکە بهۆنمەوە.

گویم لێ بوو پیاوێک لە بیرەوەرییەکانمدا گوتی: "**چینی** میلیتان بوو. پۆلیس شوێن پێیان هەڵگرتبوو."

یەکێکی تر هەڵیدایە: "وا نییە. ئەو چیتر نەیدەتوانی لەم شارە هەڵبکا. **ئەسغەرە کەچەڵ**یش لەم بەسەرهاتەدا بێ ڕۆڵ نییە. کچە هەر گەنجەکەی **چینی** لە نێو ڕەزەکاندا بە سمت و کەفەڵی ڕووت بینراوە. **چینی** چیتر ناتوانێ لەم شارە سەری بەرز بکاتەوە و بە ڕێدا بڕوا."

پیاوێکی گەنج گوتی: "ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بە **ئەسغەرە کەچەڵ**ەوە نییە. **چینی** شۆڕشگێڕ بوو، بە سمێڵە چڕ و چاویلکە ڕەشەکانیڕا دیار بوو."

کوڕێژگەیەک گوتی:

- دوێنێ **چینی**م بینی. لە تەنیشت پردەکە سەروگوێلاکی **ئەسغەرە کەچەڵ**ی شەلاڵی خوێن کرد و بە پاسکیلەکەیەوە فڕێی دایە نێو ڕووبارەکەوە.

- چەنەباز، من دوێنێ بە چاوی خۆم **ئەسغەرە کەچەڵ**م بینی، لەبەر دەرگەی دوکانەکەی ڕاوەستابوو و ساغ و سەلیم بوو.

- بەلام پاسکیلەکەی لەوێ نەبوو، هەروەها پاسکیلێکی منداڵانەمان لە چۆمەکەوە دەرهێنا. بێجگە لە **ئەسغەرە کەچەڵ** کێ پاسکیلی منداڵانەی هەیە؟

- هەرچی بێ **چینی** پیاوێکی سەیر بوو، هاموشۆی کەسی نەدەکرد.

باوکیشم بە تووڕەییەوە هاواری کرد: "لەم ماڵە بڕۆ!"

منیش لە ماڵێ ڕۆیشتم.

باوکم گوتی: "**بولفەزل**، گوێ بگرە، ئەگینا ئێمەش دەبێ ئەمڕۆ نا سبەی لەم ماڵە بار بکەین."

ئەوکات لە نێو بیرەوەرییەکانمدا بەردەوام لەگەڵ باوکم ڕام دەکرد. ئینجا لە دوای خۆمان و لە نێو تاریکیدا، ماڵێکی چۆڵمان جێ دەهێشت.

## ٢١

لە وڵاتــی خۆمــان کە کــوڕێکی گەنــج بــووم، دەبــوایە سـیوادی بەیـانی لە خەو ڕابـم. دەبـوایە بە پەلەپـڕووزێ دەست و مەچەک و ڕوخسـارم بشۆم. پاشان بە غـاردان بچـمە ژووری میوانــان و لە تەنیشــت بــاوکم دابنیشــم، پێکەوە ڕوومان لە قیبلە دەکرد و بە دەنگی بەرز چەند ئایەتێک لە کتێبی پیرۆزمان دەخوێندەوە.

لە هۆڵەنداش چاوەکـانم بەر لە دەرکەوتنی خـۆر لێک دەبـنەوە، دەموچـاوم دەشـۆم و بـۆ ژووری ڕۆنیشـتن شــۆڕ دەبــمەوە و نــوقمی خوێنــدنەوەی لاپەڕەکــانی ڕۆژنامە کۆنەکان دەبم.

بەرەبەیانێکی ساردی زستان بوو، یەکەم زستان پاش مەرگــی ڕۆنــی، کزەبــا بە بــن دەرگەی حەوشــەکەدا دەخزی و قاچە ڕووتەکانی منی سڕ دەکرد، گۆرەوییە پەشــمینەکانم لە پــێ کــرد و چــووم لە پشــت مێــزەکە دانیشتم، بۆ ئەوەی چاو بە ڕۆژنامەکاندا بخشێنم.

لە بـاخچەکەی پشـت مـاڵەوە گـوێم لە دەنگی کەسـێک بوو، پەردەکەم لا دا بۆ ئەوەی سـەیرێکی دەرەوە بکەم. بەڵام هێشتا دەرەوە ڕووناک نەببوو، ماوەیەک چاوەڕێ

مامەوە تا گزینگی خۆر لە باخچەکە بدا. ئەوسا پیاوێکم لە باخچەکەی ڕۆنیدا بینی، پیاوێک کە دمەتەشۆیەکی بە دەستەوە بوو.

بەرەو درەختەکە، بەرەو دارهەڵووژە بەستووەکە چوو. لەو شوێنەی وا درەختەکە ڕوا بوو دمەتەشۆکەی خستە نێو دەسکێکەوە، ماوەیەک ڕاوەستا و بە تەشۆ وەرگەڕایە نێوقەدی درەختەکە.

یەکشەممە بوو. دڵنیام، زۆر باش ئەو ڕۆژەم بە بیر دێ.

بە ئەسپایی دەرگەی باخچەکەم کردەوە، نەمدەویست هاواری درەختەکە لە ژێر زەبری تەشۆکە لە کیس بدەم؛ کڕاک، کڕاک.

چاوم لە سەر باخچەکە هەڵنەدەبڕی. پاش حەوت خولەک و نیو، پیاوەکە وازی هێنا، تەشۆکەی بە دەستەوە بوو و لە درەختەکەی دەڕوانی، کە هەر وا لە شوێنی خۆی وەستابوو. بە هەموو هێز شەقێکی لە نێوقەدی درەختەکە دا، درەختەکە کەوتە سەر ئەرز. چاکەتەکەم هەڵگرت، هەڵمگرت و چوومە بن دیوارەوە.

بە دەنگێکی بەرز گوتم: "ڕۆژباش."

پیاوەکە ئاوڕی دایەوە.

"**بولفەزل**، من ناوم **بولفەزل**ە."

گوتی: "ساردە. هەموو شوێنێ بەستوویەتی."

گوتم:

- پێم وایە ئێوە جیرانە تازەکەی منن.

- سووتەمەڕۆیەکی باشە.
- چی سووتەمەڕۆیەکی باشە؟
- ئەم درەختە. بۆ زۆپا یەکاویەکە. دایکم زۆپایەکی داری هەیە، ئەم درەختەم بۆ دایکم بڕیوەتەوە.
سەیری درەختەکەم کرد کە لە سەر ئەرزە سەهۆڵبەستووەکە کەوتبوو.
- ئێوە لێرە دەژین یان...
- دایکم دڵخۆش دەبێ ئاوردووی بۆ بەرم. هیچ نەبێ ئەم زستانە سەرمای نابێ.
من دەڵێم چی و ئەو دەڵێ چی! وەڵامی پرسیارەکانمی نەدەدایەوە. من دەمویست پێی بڵێم بە بوونی جیرانی نوێ دڵخۆشم، دەمویست پێی بڵێم درەختەکە هەڵووژەی گەورە و شینی پێوە دەبوون، بەڵام نەمدەتوانی بۆ ئەو جۆرە پیاوانە باسی شتی وا بکەم. بوونەوەرێکی سەیر بوو، تەنانەت ساتێک نەیدەتوانی ئارام بێ و وەڵامی پرسیارەکانی من بداتەوە. دیسان ڕووی لە درەختەکە کردەوە و ناشیانە خەریکی لەتوپەتکردنی بوو، منیش بڕیارم دا بچمەوە ژووری.
لە خوارەوە بە دەنگێکی بەرز و ڕوو لە ژنەکەم گوتم: "جیرانی نوێمان بۆ هاتووە. پیاوێکی سەیرە، بەو بەیانییە زووە بە خۆی و بە تەشۆیەکەوە. گوێت لێمە؟"
چوومە سەری.
"هێشتا هەڵنەستاوی؟ دەمویست بزانم بە تەنیایە یان خاووخێزانی هەیە، بەڵام وەڵامی پرسیارەکانی

نەدامەوە، تەنانەت خۆیشی نەناساند. هەر باسی دایکی کرد و هیچی تر. گویت لیمە؟"

نەخێر، گوێی لێم نەبوو. لە پەنجەرەوە سەیری دەرێم کرد بزانم چ ڕوو دەدا، پیاوەکە سەخت و پێداگرانە تەشۆکەی بەرز دەکردەوە و لە درەختەکەی دەدا.

"ئەمە هیچی لێ شین نابێتەوە. وا دیارە قەت جیرانی ئاساییمان نابێ. خوایە گیان! ئەرێ دە هەستە! چی لەو هەموو خەوە دەکەی؟"

لە بن لێفەکەیەوە وەڵامی دایەوە:

- یەکشەممەیە! ئەمڕۆ یەکشەممەیە پیاو! هەموان یەکشەممان تێروپڕ دەخەون.

- هەموان؟

- بەڵێ هەموان، جگە لە تۆ **بولفەزل**!

لە قسەکانیدا هەستم بە هەڕەشە کرد.

"**بولفەزل**! وەرە تۆش بخەوە! خۆ کەڵەباب نی بەو بەیانییە زووە لە بان سەرمان بخوێنی."

ئەو ژنە، ژنەکەم، کە جاران بە بێ من زاتی نەدەکرد هیچ بکا، ئەو ژنەی هەمیشە لە بەرامبەر مندا بزەیەکی نەرمی لە سەر لێو بوو، ئێستا بە زمانێکی هەڕەشەئاسا قسەی لەگەڵ دەکردم. چیتر پێویستی بە من نەبوو. بە هۆڵەندییەکی بێ کەموکوڕی دەئاخفێ و بازنەی پەیوەندییەکانی بەرفراوانتر کردبووەوە، بە دوای کارێکدا دەگەڕا و تەنانەت حیسابێکی بانکی بە ناوی

خۆی کردبووەوە. نا، نەدەبوایە چیتر ئەو شتەی وا لە دڵمدایە لای ئەو بیدرکێنم.

کەڵەبابەکەی کڵێسە لە سەربانی گەنجینەکە قیت وەستابوو، هەناسەی لە سینگیدا قەتیس هێشتبوو و سەیری درەختە درێژبووەکەی سەر ئەرزی دەکرد.

پاشنیوەڕۆ کۆلکەدارەکان بە سەرنجەوە بە تەنیشت دیواری گەنجینەوە لە سەر یەک کەڵەکە کران، پیاوەکە هەروەها دەستی کرد بە کێڵانی باخچەکە. تەنیا پیاوێک کە ئەقڵی لەدەست دابێ باخچەیەکی زوقمگرتوو دەکێڵێ. دەتگوت ئەو شوێنە هەرگیز درەختێکی لێ نەبووە کە هەڵووژەی پێوە بووبێ. من هیچم لەدەست نەدەهات، هەرچی بێ باخچەی خۆی بوو. هەتا دەرنگان هەر خەریکی گواستنەوەی کەلوپەلەکان بوو بۆ نێو ماڵەکە. بەیانی کە لە کتێبخانەی گشتی دەگەڕامەوە، چەند میلەی درێژی ئالّمینیۆمم بینی لە نێو باخچەکە دانرابوون. پاسکیلەکەم ڕاگرت و چووم بزانم چی لەم میلە درێژانە دەکا، کتوپڕ لە پشت گەنجینەکە بە خۆی و بە پەیژەیەکەوە بەدەر کەوت.

گوتم: "سڵاو جیران."

پەیژەکەی بە دیواری عەمبارەکەوە نا و چووە سەربان، نەمدەزانی دەیەوێ چ بکا.

دیسان گوتم: "سڵاو جیران."

گوتی: "پەح! بە ڕاستی ناحەزە. بە چ بیرۆکەیەکەوە شتێکی وا قێزەوەن لەم سەربانە دانراوە!"

هەر وا کە لە سـەر دەسـت و چـۆک سـەردەکەوت، لە کەڵەبـابەکە نزیـک بـووە. توونـد دەسـتی بە قـاچی کەڵەبابەکەوە گرت و هەستایە سەر پێ.
"حەح! بۆ وا قایم کراوە. دەبێ بیبڕمەوە."
لێم پرسی:
- بـۆچی دەیبـڕنەوە؟ وازی لـێ بێـنن بـا لەوێ بـێ. ئازاری بۆ کەس نەبووە.
- نـامەوێ کەڵەبابێـک لە سـەربانەکەم بـێ. دەمەوێ لە باتێ ئەم کەڵەبابە ئانتێنەکەم دابنێم.
پڕی دایە هەنـدێک سـەرووتری کەڵەبـابەکە و هەوڵـی دا هەڵیکەنێ.
"بە قوڕێ گیرێ، لێ نابێتەوە.'
بە تـوڕەییەوە سـەری کەڵەبـابەکەی گـرت و تـوانی لە بنڕا هەڵیکەنێ.
"ئەم شتە قۆڕە بۆ نێو زبڵ باشـە"، وای گـوت و فڕێـی دایە بن دیوارەکەوە.
لەبەر کەڵەبـابەکە خەو لە چـاوم نەدەکەوت. بـێ ئەوەی دەنـگ دەربـخەم لە خەو هەسـتام، بە نـووکی پـێ بە قادرمەکاندا شۆڕ بوومەوە و چوومە ژووری ڕۆنیشـتن. چـاکەتەکەم پۆشـی، پاشـان شـەپقەکەم لە سـەر کـرد و گورگـانەپێ خـزامە بـاخچەکەوە. هەوای سـارد بـوو و ئەستێرەکان ئاسمانیان داپۆشیبوو. دەمویست بچمە نێو بـاخچەی جیرانەکەمـان و کەڵەبـابەکە لە نێـو زبـڵ و زاڵەکە دەربێنم، بەڵام کە چوومە دەرەوە و لە سـەرمان

هەڵەرزیم، دڕدۆنگی بەسەرمدا زاڵ بوو. کەڵەشێرەکە چیتر کەڵکی نەبوو. ئەوەی ڕاستی بێ بیرەوەرییەکی ژەنگاوی بوو و هیچی تر، بۆ ئەوە دەبوو بخرێتە نێو کەلوپەلە بێسوودەکانەوە. دەبوایە دوورتر بڕوانم، دان بە جەرگمدا بگرم. ئەم میلە ئالّمینیۆمانە هەر وا بە خۆڕایی لە باخچەکە دانەنرابوون، ڕەنگە ئەم پیاوە شتێکی باشتر لە شوێنی بەتاڵی ئەم کەڵەشێرە دابنێ. کێ چووزانێ، ڕەنگە هەموو شتێک باشتر لەوەی بیری لێ دەکەمەوە ڕوو بدا.

چووم دەورێکم بە تەنیشت کارێزەکەدا لێ دا، بە سەر پردە دارینەکەدا تێپەڕیم و بە قەراغ مەزراکاندا پیاسەم کرد. هێشتا پەنجەرەکان ڕووناک نەببوونەوە و سەگەل لە شیرین خەودا بوون. بەرەو بەنداو درێژەم بە ڕۆیشتن دا. مانگ تریفەی دەهاویشت، مەلێکی دەریایی لەوبەری چۆمەکە بە پێوە وەستابوو.

یەک بە خۆم هاوارم کرد: "هەوا ساردە! زۆر ساردە مەلەکە! پێم بڵێ! تۆش قەرەوێڵەکەت جێ هێشتووە؟"

کەمێک لە جێی خۆی جووڵایەوە، پاشان سەیرێکی کردم.

"خەوت نایە؟"

لە شەقەی باڵی دا، من درێژەم بە ڕێگەکەی خۆم دا. کەڵەبابەکە لە نێو خەیاڵەکانمدا بازی دا و لە سەر شانی ڕاستم هەڵنیشت. پاشان بەرەو مێرگوزارەکە فڕی و لە بەر چاوان ون بوو.

## ٢٢

ڕۆژی سێیەم بینیم جیرانەکەمان هەوڵ و تەقەلایەتی میلەی ئاسنی درێژ بباتە سەربان، بە ئاستەم دەیتوانی هاوسەنگی خۆی بپارێزێ.

"ئایا دەتانەوێ یارمەتیتان بدەم؟"

لە بەر خۆیەوە گوتی: "نا نا، خۆم جێبەجێی دەکەم."

لەگەڵ ئەوەشدا سەرێکی میلەکە کەوتە ئەرز.

گوڕاندی:

- بە قوڕێ گیرێ!

- ڕاوەستن. هەڵی دەگرمەوە.

وام گوت و بە سەر دیوارەکەدا بازم دا تاکو بچمە نێو باخچەکەی، میلەکەم هەڵگرت و بە پەیژەکەدا سەرکەوتم.

"بەردەوام بن، من ئەم سەرەی میلەکەم گرتووە."

چوومە سەربان و توووند دووماهیی میلەکەم گرت. تا کولانەی ئاگردانەکە چوو، کێبڵی کونتێکەرەکەی لە کارەبا دا و چەند کونی لەملا و ئەولا کرد. لە لایەکەوە چەند ئەڵقەیەکی لێک گرێ دا و هاواری کرد: "ئەو میلە درێژەم پێ بدە!" میلەکەم پێ دا. بە ئاستەم توانی

میلەکە ڕێک ڕابگرێ، پاڵی بە دووکەڵکێشـەکەوە دا و بە هەموو هێزی خۆیەوە ئەڵقەکانی لێ گرێ دا.
ئینجا بە دەنگێکی بەرز گوتی: "ئەوەی ترا!"
میلەکەی ترم پێ دا، لەودیوی تری دووکەڵکێشـەکەیەوە قایم کرد.
چەنـد جارێـک هـاتمە خـواری و چـوومەوە سـەرێ و بەشـە جوراوجۆرەکـانی ئـانتێنەکەم پـێ دا. بەم جـۆرە نزیکەی دوو کاتژمێر پێکەوە کارمـان کـرد، بەڵام بێجگە لە دوو مـیلەی ئاسـنین لە پاڵ دووکەڵکێشـەکە کە بەرەو ئاسمان بەرز ببوونەوە، هیچی ترم نەبینی.
گوتم:
- سەرنجڕاکێشە.
- چی سەرنجڕاکێشە؟
- ئەم دەعبـایە. ڕواڵەتـی لە هـیچ نـاچێ. دەتـانەوێ چـی پێ بکەن؟
- ئێستا ئەو سیمەم پێ بدەن. دەبێ ئانتێنەکە باش قـایم بـــکەم، ئەگینـــا بە هەڵکردنـــی یەکەم بـــا لە بەر یەک هەڵدەوەشێتەوە.
چـووم لە گەنجیـنەکە تۆپەسـیمێکی گەورەم هێنـا، بە زگەخشکێ لە سەربان تۆپە سیمەکەم پێ دا.
پرسیارەکەم دووبارە کردەوە:
- دەتانەوێ چ لەم دەعبایە بکەن؟
- ئەو تێلپسێنە.

تێلپسێنەکەم پێ دا، سیمەکەی کردە چەندین پارچەی گەورە.
هاواری کرد: "ئەو ئەڵقانە!"
یەک بە دوای یەک ئەڵقەکانم پێ دا، لە چەند جێگەوە سیمەکانی لە ئانتێنەکە بەست.
پاشان گوتی: "با بچینە خوارێ."
چووینە خوارێ. ئەم جارەیان ویستی سیمەکان لە چەند شوێنێک قایم بکا.
گوتی "بە ئێرەدا" و ئەوسا بە ئامێری کونتێکەر و جێ کارەباوە ڕووی کردە گەنجینەی یەکێک لە جیرانەکان.
کێبڵی کونتێکەرەکەی خستە نێو کارەباوە و بە دەنگەدەنگێکی زۆرەوە دەست بە کار بوو. پیاوێکی ورگن بە پەلە هاتە دەرێ.
"ئەوە خەریکی چین؟ چ دروست دەکەن؟"
جیرانەکەم وەک ئەوەی شتێک نەقەومابێ، گوتی:
- ئێرە کون دەکەم.
- کونی چی؟ مافی ئەوەتان نییە دیواری من کون بکەن.
- حەیف، دەبێ دیوارێکی تر بدۆزمەوە.
پەنجەرەی جیرانەکان کرانەوە، دەموچاوەکان بەدەر کەوتن.
پیاوێکی تر لە پەنجەرەکەیەوە پرسی:
- چ ڕوو دەدا؟
- خەریکە بێ مۆڵەت دیوارەکەم کون دەکا. شتێکی سەیرە! وا نییە؟ ئەو جیرانانەی ئێستا دێن سەیرن؛ پێی

وایە دەتوانێ بە کەیفی خۆی هەموو شتێک بکا، تەنانەت دیواری خەڵکی کون بکا!

گوێی لە قسەکانی پیاوەکە نەبوو، دەتگوت کەڕە و هیچ نابیستێ.

پێی گوتم: "ئەو پەیژەیە."

بێ ئەوەی شتێک بڵێم، چووم پەیژەکە بێنم. منیش سەرم سوورمابوو، چۆن بوو ملم بۆ هەموو فەرمانەکانی ئەو پیاوە دادەنواند کە تەنانەت ناوەکەیشم نەدەزانی! بۆچی هەرچی داوای کردبا ئەنجامم دەدا؟

ئەو ڕۆژە چ ڕووی دابوو کە من هێندە ملکەچ بووم؟

ئاخۆ لەبەر شێوازی هەڵسوکەوتەکەی بوو؟

لەبەر ئەوە بوو کە پەیوەندییەکانی زۆر بەرتەسک بوو؟ کەمتەرخەم بووم؟ یان تۆ بڵێی ئانتێنەکە مەراقی وروژاندبم؟

پەیژەکەم هێنا و بە نێوقەدی درەختێکمەوە نا کە لە قەراغ کۆڵان هەڵکەوتبوو.

بە پەیژەکەدا سەرکەوت و چووە سەر درەختەکە.

گوتی: "ئەو تێلە!"

تێلەکەم پێ دا، بە لقێکی ئەستووری بەستەوە. پاشان پەیژەکەم بردە بن دارێکی دیکە و تێلەکەی ترمان بە ئەوێوە گرێ دا.

ئەوسا گوتی: "جا ئێستا با بڕۆینە گەنجینەکەی تۆ."

بە واقوڕمانەوە پرسیم: "گەنجینەکەی من؟"

دەمویست نارەزایی دەرببڕم و بڵێم: "نا، ناتوانن ئەمە لە گەنجینەکەی مندا ئەنجام بدەن."

بەڵام گەنجینەکە هی من نەبوو، گەنجینەی هۆڵەندییەکان بوو و مۆڵەتیان پێ دابووم سوودی لێ وەربگرم.

گوتی: "کونکەرەکە."

کونکەرەکەم پێ دا، لە چەند جێ دیوارەکەی کون کرد، پێچی گەورەی لە کونەکان ئاخنی، دوایین سیمی لێ قایم کردن و بە دەنگێکی بەرز گوتی: "تەواو، جێبەجێ بوو."

بێ ئەوەی قسەیەک لە زاری بێتە دەر، کونکەرەکە و تێلپسێنەکەی هەڵگرتەوە و گەڕایەوە نێو باخچەکەی.

ڕۆیشتمەوە ماڵێ، دەستەکانم شۆرد و چوومە پشت پەنجەرە.

ئانتێنێکی سەیر لە سەربان بەرز ببووەوە. مەلێک بەدەر کەوت، سەرەتا بە دەوری ئانتێنەکەدا سووڕایەوە و پاشان لە سەری هەڵنیشت.

تۆ بڵێی ئەو پیاوە بنەماڵەی هەبێ؟ هاوسەرێک؟ کوڕێک؟

هەرچی بێ دایکێکی هەبوو. دەمزانی دایکی هەیە، لەبەر دایکی درەختەکەی لەتوکوت کرد.

تۆ بڵێی لە ماڵی دونیا تەنیا دایکێک و ئانتێنێکی هەبێ؟

سەیرن! زۆر سەیرن ئەم هۆڵەندییانە! بۆ نموونە پیاوانی ئەم گەڕەکە، هەموویان لە من دەترسن. وەک

بلێی نەخۆشییەکم هەبێ و بۆ ئەوانی تر بگوازرێتەوە. هەر کە دەرگەی ماڵەکەم دەکەمەوە و پێ دەنێمە کۆلانەوە، بە پەلەپڕووزێ خۆ بە ژووریدا دەکەنەوە.

پێویستی نەدەکرد بچنەوە ماڵەکانیان، بەس دەیانتوانی دەرفەتی ئەوەم پێ بدەن کەڵک لەو ڕستە هۆڵەندییانە وەربگرم کە بۆ کاروباری ڕۆژانە فێریان ببووم، وا نییە؟

"سڵاو، من **بولفەزل**م، ئێوە ناوتان چییە؟"

هەندێک ژن زاتیان دەکرد وەڵام بدەنەوە.

- سڵاو!

- سڵاو، بەڵێ هەوا ساردە. وڵاتی ئێمە؟ ساردە ئەویش. چیا، چیای بەرز. کڵاوی کۆن.

- کڵاوی کۆن؟

- مەبەستم ئەوەیە کڵاوێکی کۆنی بەفرین بەردەوام ترۆپکی چیاکانی داپۆشیوە. جا لەگەڵ بارینی بەفری نوێدا، چینێکی ئەستوور دەچێتە سەر چینەکانی پێشوو.

- ئەها! مەبەستتان بەفری نەتواوەیە؟

- بەڵێ، نەتواوە، خۆیەتی، بەفری نەتواوە.

سەیرن، هۆڵەندییەکان هەموویان سەیرن. بەمەی ئێستاشەوە.

دواتر تێگەیشتم کە نەدەبوایە چاوەڕوانی هیچ شتێک بم، نە سوپاسێک، نە کاردانەوەیەک. دەبوایە بە جۆرێک نزیک ببمەوە وەک بلێی مەل یاخود قازێک بێ؟ نا، ئەو وشەیەم نەدۆزیوەتەوە کە پڕ بە پێستی خۆی بێ.

ڕەنگە درەختێک؟ نا، نا درەختیش نا. وەک بڵێی ئەسپێک بێ. بەڵێ، وەک ئەوەی ئەسپێک بێ. چ چاوەڕوانییەکت دەکرێ لە ئەسپێک هەبێ؟ هیچی ئەوتۆ؛ دەچیتە لای، یاڵ و قژی دەلاوێنیتەوە، جارجارە قسەی لەگەڵ دەکەی، هیچیش پێت سەیر نابێ لەو کاتەدا لە بری ئەوەی سەیرت بکا، پاشەڵی بکاتە تۆ.

پێم وایە دەبوایە بەم جۆرە لەگەڵ جیرانەکەمدا هەڵسوکەوتم بکردایە، دەستپێشخەر بم.

دەستپێشخەربوون دەستەواژەیەکی گونجاو نییە. دەبوایە بچم ببینم، بێ ئەوەی خۆی داوا بکا. هەرچی بێ، ئەگەر بتەوێ نزیکی ئەسپێک بیتەوە، پێویست ناکا مۆڵەتی لێ وەربگری.

ئێوارە بینیم لە ژووری دانیشتنەکەی سەرقاڵە، لە دەرگەی باخچەکەم دا و وە ژوور کەوتم.

- ئانتێنەکەت هێشتا کاری ماوە؟

- ئەوەی ڕاستی بێ ئەمە ئانتێن نییە.

- من هەر تێنەگەیشتم دەتەوێ بەم ئانتێنە چی بکەی.

- بۆ پەیوەندیبەستنە. لە ڕێگەی ئەم ئانتێنەوە پەیوەندی چێ دەکەم.

- لەگەڵ کێ؟

- چووزانم! لەگەڵ کێ بێ گرنگ نییە. هەر کەسێ پێی خۆش بێ.

- لە کوێن گشت ئەو کەسانەی وا پێیان خۆشە؟

- له سەر شەپۆلەکان. دەگەڕێم، دەوەستم. له نێو فەزاکەدا کەسێک به ڕێکەوت هەڵدەبژێرم.
- دەگەڕێی، دەوەستی و هەڵدەبژێری؟
- زەنگ لێ دەدەم، بەسەر کەسێکدا دەکەوم. دوگمەکه دەسووڕێنم و...
- کام دوگمە؟
- له سەرەوەیه، له ژوورەکەی بنمیچی. پاشان زەنگ لێ دەدەم، 'ئەلۆ! ئەلۆ! ئەلۆ!'
نەیدەویست بمباته ژوورەکەی بنمیچی، نەیدەویست دوگمەکەم پیشان بدا. "ئەلۆ، ئەلۆ، ئەلۆ." چی "ئەلۆ، ئەلۆ، ئەلۆ"؟
گوتم:
- سەرنجڕاکێشه. لەو ژوورەی سەرێ دانیشی، دوگمەیەک بسووڕێنی و بڵێی 'ئەلۆ، ئەلۆ، ئەلۆ'. ئەی بێجگه لەمه چی دەکەی؟"
- هیچ. هێدفۆنەکه دەکەمه گوێم و ئەگەر دونیا بوو بەسەر کەسێکدا کەوتم، باشتر.
ژوورەکەی بنمیچی و دوگمەکه مەراقیان وروژاندبووم، بەڵام ئەو له پشت مێزەکەی بێباکانه دانیشتبوو و هەندێک کەرەستەی کارەبایی نووژەن دەکردنەوه و پێکەوەی گرێ دەدان.
هەمدیس گوتم: "سەرنجڕاکێشه."
دیسان بیرم بۆ ئەسپێک چووەوە.

بە خـــۆمم گـــوت بەردەوام بە، قســـەی لەگەڵ بـــکە، پرسـیارەکانتی لـێ بـکە. ئەگەریـش پشـتی تـێ کـردی، لێگەڕێ با غار بدا!

"ئێ؟ ناتەوێ ئەو دەزگایەتم پیشان بدەی؟"

ســەرەتا هیچــی نەگـوت، پاشــان کەلوپەلەکـانی ســەر مێزەکەی لێک جیا کـردەوە و هەسـتایە سـەر پـێ. بـێ ئەوەی ســـەیرم بکـا، بە پلیکانەکانـدا بەرەو ژوورەکەی بنمیچی سەرکەوت، دوای کەوتم.

گڵـۆپەکەی هەڵکـرد، وەک هەمـان ژووره شـپرێوەکەی ڕۆنـێ بـوو، کەلوپەلەکـانی لە سـەر ئەرز فـڕێ دابـوون. پشـتی چەمانـدەوە و چـوو لە پشـت مێزێکـی تەنیشـت پەنـجەرەکە دانیشـت، لە سـەر مێزەکە دەزگـایەکی کۆن هەبوو کە لە جۆرێک ڕادیۆی سەیر دەچوو.

- ئەم دەعبایە چییە؟

- دەزگایەکی پەیامنێرە.

دەتگوت دەزگایەکی سەردەمی جەنگی جیهانیی دووەمە.

پرسیم: "ئەم دەزگا کۆنەت لە کوێ دۆزیوەتەوە؟"

دوگمەیەکـی گەورەی سـووڕاند و هێـدفۆنێکی کـۆنی لە گوێ کرد و مایکرۆفۆنێکی لە زاری نزیک کردەوە:

- ئەلۆ، ئەلۆ. گوێتان لە دەنگمە، ئەلۆ!

- لەگەڵ کێ قسە دەکەی؟

- ئەلـۆ، ئەلـۆ، گـوود ئەڤنینـگ. ئەلـۆ، ئێوارەبـاش. هەلەو زێ نێتێئرلانـــدێز، یەعقـــووب، یەعقـــووب. حەح! هـــیچ کاردانەوەیەک نییە.

گوتی: "هێشتا زۆر زووە. جگە لەمە دەزگاکە کۆنە، پەیامەکان خراپ دەنێرێ. پەیوەندیبەستن لەگەڵ دەرەوە ئەستەمە. ئەلۆ... هەلۆ... گوود ئەڤنینگ." بە دەم قسەکردنەوە درێژەی بە سووڕاندنی دوگمەکە دا. "ئەلۆ... **یەعقووب**، گوێت لە دەنگمە؟ **یەعقووب**، ئێوارەباش. ڕێک وایە، ئەوە پانزە ڕۆژە، وایە. ماڵەکەم گواستووەتەوە. ئەلۆ، ئەلۆ... لەوێی؟ ئیدی دەنگت نابیستم. دیسان ون بووەوە."

لێم پرسی:

- **یەعقووب** کێیە؟

- منم. **یەعقووب** منم.

- ئێ! **یەعقووب** تۆی؟ ئەی ئەوەی قسەت لەگەڵ دەکرد کێ بوو؟

- چووزانم! پیاوێکە لە تەمەنی مندا. بەس دەتوانم ئەوەندەت پێ بڵێم. زۆربەی کاتەکان لەم کاتژمێرەدا تووشی دەبم، ماوەیەک پێکەوە قسە دەکەین. دەبێ هەوای دەرەوە خراپ بێ، کە بای بێ ئەمە کار ناکا.

- لەگەڵ ئەم پیاوەدا سەبارەت بە چی قسە دەکەی؟

- چووزانم! هەرچی بێ. سەبارەت بە هەموو شتێک و هیچ شتێک. ئەلۆ، ئەوە هاتییەوە. گوێت لێمە؟ دایکت نەخۆش بوو، ئێستا باشترە؟ وەک خۆیەتی؟ گوێت لێمە؟ کە بای بێ کار ناکا.

- بێجگە لەمە چ پەیوەندییەکت لەگەڵ ئەم پیاوەدا هەیە؟

- هیچ. خۆ پێم گوتی، قسە دەکەین و هیچی تر. شەوانە دوروبەری کاتژمێر حەوت تووشی دەبم. کاتژمێر نۆیش بەردەوام لەگەڵ کەسێکی دی قسە دەکەم.

- ئەو کەسەی دی کێیە؟

- پیاوێکە کە دێتە پشت هێڵ.

- تۆ هەمیشە لەگەڵ هۆڵەندییەکان قسە دەکەی؟

- نا، هەمیشە نا. جارجارە لەگەڵ ئاڵمانییەک، جاری وایە لەگەڵ بەلجیکییەک و جارجارەش لەگەڵ کەسێکی خەڵکی **لەندەن** قسە دەکەم. جاری وایە گوێم لە دەنگی عەرەبێک دەبێ. من لە زمانی عەرەبی تێناگەم، ئەی تۆ؟

- ئەمنیش لە عەرەبی تێناگەم.

- ئێ، بۆ تۆ عەرەب نی؟

- نا، من فارسم، ئێرانیم.

- ئەها، دەنا من وام دەزانی تۆ عەرەبی. مەرحەبا مەرحەبا، ئەلسەلاموعەلەیکوم، ئەمە زمانی تۆ نییە؟

- نەخێر، مەرحەبا مەرحەبا بە زمانی من نییە، ئەلسەلاموعەلەیکومیش هیی زمانی ئێمە نییە. بەڵام سەلام با.

- ئەها، سەلام؛ کەوابێ تۆ ناوت **سەلام**ە.

- نا نا، ناوم **سەلام** نییە، ناوم **بولفەزل**ە، سەلام وشەیەکە وەک هەلەو، سڵاو، چۆنی و باشی.

- ئەها، ئاوا!!

وای گـوت و هێـدفۆنەکەی بەرەو لای مـن ڕاداشـت.
- تـاقی کەوە. بڵێ 'سـەلام، سـەلام، سـەلام' و دوگمەکە بسـووڕێنە. ئەگەر گوێـت لە وەڵامێـک بـوو، درێـژە بە قسـەکردن بـدە، دەبـێ بـێ ڕاوەسـتان قسـە بـکەی. تێدەگەی؟

هێـدفۆنەکەم لە گـوێم کـرد، مـایکرۆفۆنەکەم نزیـک کردەوە و دوگمەکەم سووڕاند.

- ئەلۆ... ئەلۆ... ئەلۆ... سـەلام، سـەلام، گوێت لێمە؟ سەلام **تووتی، تووتی، تووتی**.

- باسی چ دەکەی؟

- گوتم **تووتی، تووتی**.

- دەتەوێ بڵێی چی؟

- هـێچ. بەس ویسـتم یەک دوو وشـە بە فارسـی دەرببڕم، بەڵام گوێم لە هیچ نەبوو هاشەهاش نەبێ.

- پێی ڕادێی. نابێ گوێ بە هاشەهاشـەکە بدەی، دەبێ لە سەر دەنگەکان چڕ بیتەوە. زوو دەنگێک هەڵبژێری و بیدوێنی.

- سەرنجڕاکێشە. بە ڕاستی سەرنجم ڕادەکێشێ. حەز دەکەم دەزگـایەکی وەک ئەوەم لە ژوورەکەی بنمیچیـدا هەبێ، لە سەر شەپۆلەکان لەگەڵ هەر کەسێ قسە بکەم. لەگەڵ کەسـێک کە نـایبینی، ئـازادانە قسـەی ناخـت هەڵبڕێژی.

دوگمەکەی سووڕاند و گوتی: "دەبێ بڕۆم پاروویەک نان بخۆم."

چووینە خوارێ، ئەو بەرەو ناندێنەکە ڕۆیشت و من بەرەو باخچە.

لە نێو باخچەکەدا جگەرەیەکم داگیرساند و سەیری ئانتێنەکەم کرد.

**یەعقووب ئانتێنێکی هەبوو.**

باوکم چالاوێکی هەبوو. ئەو شەوە کەس لە ماڵێ نەبوو، باوکم و من نەبێ. من لە سەر دۆشەکەکەم لە تەنیشت باوکم ڕاکشابووم. لە خەوما گوێم لێ بوو کەسێک دەگری، چاوەکانم هەڵێنا و لە سەر جێگەکەم بەرز بوومەوە. پەردەکان دادرابوونەوە و کەسێک لە حەوشەکە دەگریا. دەمویست باوکم بەخەبەر بێنم، بەڵام لەوێ نەبوو. شوێنەکەی چۆڵ بوو، ترس بەسەرمدا زاڵ بوو. بەرەو پەنجەرەکە چووم و بە هێمنی سووچێکی پەردەکەم لادا، مانگ حەوشەکەی ڕووناک کردبووەوە. دەنگی گریان دەهات، بەڵام کەس نەدەبینرا. لە نزیک چالاوەکە تاپۆیەک جووڵایەوە، کە لە بەردەم چالاوەکە چۆکی دادابوو. بەرەو لێواری بیرەکە شۆڕ بووەوە و دەستی کرد بە قسەکردن، لەگەڵ بیرەکە دەدوا و بە دەنگی بەرز دەگریا. خوایە گیان! خۆ ئەوە باوکم بوو!

باوکم دەگریا، چ دیمەنێکی سامناک بوو کە دەمبینی دەگری! نەمدەتوانی ماوەیەکی زۆر سەیری باوکە چاو بە گریانەکەم بکەم. ئەو بەردەوام پێی گوتبووم کە پیاو بۆی نییە بگری. بە دڵێکی پڕەوە لە جێگەکەم خزامەوە، لێفەکەم بە خۆم دادا و بەدەم بیرکردنەوە لە باوکم

گریام. لەناکاو گوێم لە دەنگی هەنگاوە نەرمەکانی بوو، بە ئەسپایی دەرگەی ژوورەکەی کردەوە و هاتە ناو.

- وەی! ئەوە هەستاوی ڕۆڵە؟ دەگری؟ بۆچی دەگری ڕۆڵە گیان؟

- ئێوە دەگریان باوکە! ئێوە لە تەنیشت چاڵەکە دەگریان!

ساتێک بێدەنگ ما. پاشان لە لام ڕاکشا و قۆڵی چەپی لە بن سەرم دانا، سەری خۆیشی لە سەر قۆڵی ڕاستی دانا.

- پیاویش بۆیان هەیە بگرین ڕۆڵە، محەمەدی پێغەمبەریش دەگریا. جارجارە لە پەنا چاڵێکی پەراوێزخراو و بەگشتیش لە سەر چیای حەڕرا. **محەمەد** چل ساڵی تەمەن بوو.

- لە تەمەنی ئێوەدا بوو باوکە؟

- بەڵێ، لە تەمەنی ئێستامدا. شەوانە خۆی دەگەیاندە **چیای حەڕرا.**

- بۆچی بە شەو؟

- بۆ ئەوەی لە شوێنێکی چۆڵ قسە بکا.

- قسە بۆ کێ باوکە؟

- بۆ ئاسمان. عەباکەی بە خۆیدا دەدا و بە هێمنی بەرەو لوتکە هەڵدەکشا، مانگ دەگەشایەوە. شارەکەی بن داوێنی چیا نوقمی بێدەنگی بوو. مەلێک لە ئاسماندا نەدەفڕی، هیچ سەرمازەڵەیەک بە نێو بەردەکاندا

نەدەخووشی. دونیا لە خەودا بوو. تەنیا شەو و ئاسمان و **محەمەد** بەخەبەر بوون.

- **محەمەد** چیی بە ئاسمان دەگوت؟

- بەرەو ئاسمان دەستی لێک دەکردەوە و هاواری دەکرد، 'چیتر ناتوانم، چیتر ناتوانم.'

## ٢٣

کارێکی کاتیم لە بەشی ئەرشیفی شارەوانی دۆزییەوە. گەنجینەیەکی کۆن، کە تیایدا بە هەزاران دۆسیەی کۆن، هیی ئەو کەسانەی مردبوون، هیی ئەو مالانەی نەمابوون و هیی ئەو کارگانەی تەنیا چەند بەڵگە و کاغەزێکیان لە دوا جێ مابوو. کارێکی گونجاو بۆ بیانییەک کە نایەوێ چیتر لە مالێ بمێنێتەوە. ئیشی من ئەوە بوو کارتۆنەکان بکەمەوە و کاغەزەکان ڕێکوپێک بکەم، وێنەیان لێ بگرم، پەڵەکانیان بسڕمەوە و لە سەر مێزێکیان دابنێم. فەرمانبەرێک هەموو پاشنیوەڕوان دەهات.

"دەبێ بژیوی ژیانت دابین بکەی، وا نییە؟ ئیتر وایە، لە هەموو شوێنی پارە هەڵڕژاوە، بەلام خەڵک نایەوێ کۆی بکاتەوە."

فەرمانبەرەکە جارجارە لەبیری دەچووەوە بێ. لەوە دەترسام کەسێک بە هەڵکەوت دەرگەکە بە کلیل قفڵ بدا و لەوێ، لە نێو تاریکیی گەنجینەکەدا بە تەنیایی جێم بهێڵن. پەیتا پەیتا دەرگەکەم کۆنترۆل دەکرد.

لەگەڵ ئەمەشدا حەزم دەکرد لەو گەنجینەیە درێژە بە کارکردن بدەم، نێوانی من و ژنەکەم بە هیچ شێوەیەک باش نەبوو.

بە مەبەستی چاوپێکەوتن بۆ دوکانێکی شۆکۆلات بانگهێشت کرابوو، دەیویست بە بێ من ژیانی بونیاد بنێتەوە. هەموو حەوت ڕۆژێ کەمێکی تر لە باڵادەستیی خۆمم لە کیس دەدا. لە وڵاتی خۆم شان و شکۆیەکم هەبوو، ئێستا ئیتر ببوومە پەیژەهەڵگری **یەعقووب**ی جیرانمان، هاوکاری مشکە پیرەکان. بەڵام قەی نەدەکرد، دەبوایە متمانەم هەبێ و دان بە بوونی نوێمدا بنێم. ماوەیەکی تر لەو گەنجینەیە درێژە بە کارکردن بدەم، ماوەیەکی تر وەک پیاوێکی دەستکورت بژیم. دیسان قۆناغێکی ڕێکوپێک خەریکی چاودێری بم، کازیوەی بەیانی لە خەو ڕا بم و ڕۆژنامە کۆنەکان بخوێنمەوە. ئەزموونەکانم پێیان دەگوتم ئەمە ماوەیەکی زۆر ناخایەنێ.

بەیانییەک کە ویستم پەردەکان لا بدەم، بینیم بەفرێکی قورس ئەرزی داپۆشیوە. لە باخچەکەی **یەعقووب** چاوم بە شۆفیرێک کەوت. هێدفۆنەکەی لە گوێ کردبوو، ساکێکی چەرمی پێ بوو و سەیری ئانتێنەکەی دەکرد. پەردەکەم تەواو لا دا و پەنجەرەکەم کردەوە.

گوتم: "سڵاو."

پیاوەکە هێدفۆنەکەی هەڵگرت.

"**یەعقووب**!"

**یەعقووب** شۆفیر بوو.

**یەعقووب** ئەو پیاوە بوو ڕۆنیی پان کردبووەوە؛ ئەوە بیرۆکەیەک بوو بەردەوام ختووکەی مێشکمی دەدا.

نەمـــدەتوانی کتـــوپڕ ئەم بیـــرۆکەیە بە لۆژیـــک شـــی بـــکەمەوە. ئەگەر بە دەنگێکـــی بەرز هێنابـــامە زمـــان، هەنـــدێک پـــووچ دەهـــاتە بەر چـــاو. ئەگەر بە نووســـین تۆمـارم کردبـا، نەمـدەتوانی بە ڕاسـتییەکان بیسـەلمێنم. ئەگەر بە ژنەکەمـم گوتبـا، بـۆی هەبـوو پێـی وابـێ مـن شـێت بووم. بەڵام پێویستم بەوە نەبوو بە دەنگی بەرز بیر بکەمەوە، پێویستم بەوە نەبوو بۆ کەسانی دیکەی شی بکەمەوە. دڵەکوتە، فشاری نێو چاوەکان، پێستی پڕ تـین و تـا، دارەکە، هێدفۆن، سـاکە چەرمییەکە، هەمـوو ئەمـانە هاواریـان دەکـرد کە **یەعقـووب** ئەو پیـاوەیە، شـۆفیری شـەمەندەفەر. خـۆ مـن گەمـژە نەبـووم، بـۆ لە وڵاتـی خـۆم بیرکـاریم نەخوێنـدووە؟ لە نێـو چەنـدین کارگەدا کارم کردبوو، فێر ببووم لۆژیکانە بیر بکەمەوە. دەمزانی، هەروەهـا ئەوەشـم دەزانـی کە زۆر گـۆڕدراوم. لە لـۆژیکی جـاران شـتێکی ئەوتـۆ نەمـاوەتەوە، مـن هەڵاتوویەک بووم و هەڵاتنیش لۆژیکی تـایبەت بە خـۆی هەیە، بە شـێوەیەکی تەواو جیـاواز بیـر دەکەیـتەوە. ئەوەی ڕاسـتی بـێ بە هـاوڕێیەتیی مشـکە کۆنەکـان خەریک بوو لە بیرە لۆژیکییەکانی جارانم کۆچم دەکرد و پەرەم بە هیی نوێ دەدا.

لە گەنجینەی شارەوانی بە گوێرەی پێویست کاتم هەبوو بیر بکەمەوە، هێدی‌هێدی تێگەیشتم کە دەبێ بە شێوەیەکی جیاواز بژیم، خۆم نەرمونیانتر پیشان بدەم، پتر مەترسی بگرمە بەر چاو. نەدەبوایە گرنگی بەوە بدەم کە ڕێگەم داوە ژنەکەم لە چنگم ڕا بکا یان کوڕەکەم نایەوێ تەنانەت وشەیەک بە زمانەکەم قسە بکا. سەرەتا پێم وا بوو ژیانم سەراوبن بووە بەڵام نا، سەراوبن نەببوو، تەنیا شتەکان لە ڕەوتێکی جیاوازدا خۆیان دەنواند. بەم شێوەیە ئازادییەکی پترم بە مێشکم دەدا، ژیانم کەمتر بە هەند وەردەگرت، ڕۆحم نەرمونیانتر هەڵسوکەوتی دەکرد؛ ئەو پیاوە **یەعقووب** خۆی بوو.

بەرەبەرە فێر بووم متمانەیەکی زیاتر بە هۆش و بیری خۆم بکەم، جاران پێم وا بوو هەڵاتنم هەڵەیەکی گەورە بووە و نەدەبوایە لە نیشتمانی خۆم هەڵاتبام. بەڵام ئێستا بە ئەنجامێکی تر گەیشتووم؛ هەڵاتن شتێک نەبوو هەڵیببژێری، بەڵکو باسەکە کاردانەوە بوو. ڕەوتێکە لە دەرەوەی ویستی خۆت ڕێ دەگرێتە بەر، هێزێکی لە کۆنترۆڵ بەدەرە. بۆ نموونە سێوێک، دارسێوێک، کە سێوێک گەیشت، لەگەڵ هەڵکردنی یەکەم بادا لە درەختەکە لێ دەبێتەوە. گوناهـ بوونی نییە، سزا شتێکی پووچە. پرۆسەکە لە وەختی خۆیدا بەدی دێ. خۆر، مانگ، درەخت، لق و زەوی دەست دەدەنە دەستی یەکتری و بڕیار دەدەن سێوەکە بخەن.

دەرفەتی ئەوەم هەبوو لە سەر ئەو ڕێگەیە بەردەوام بم کەوا گرتبوومە بەر، پرۆسەکە دوورتر لەوە بوو کۆتایی بێ. ئێستا شۆفیری شەمەندەفەر لە نێو باخچەکەدایە و ڕێک ئەو پیاوە بوو کە پێویستیم پێی بوو. دەبوایە بچم قسەی لەگەڵ بکەم، لەگەڵ **یەعقووب**ی شۆفیردا.

**یەعقووب**، ئەوە تۆ بووی **ڕۆنیت** وەبەر دا؟

نەمدەتوانی پرسیارێکی لەم چەشنەی لێ بکەم. ئەمە کێشەی من بوو، ئەو هیچ پەیوەندییەکی بەوەوە نەبوو.

"کاتێک ببینی پیاوێک کتوپڕ خۆ دەخاتە سەر ڕێگەی بەردەم شەمەندەفەرەکەت، چ دەکەی؟" بێ ئاگەداریی پێشوەخت وە ژوور کەوتم، لە کاتێکدا لە پشت دەزگاکەی دانیشتبوو و پشتی لە من بوو.

ڕاچەنی و سەیری کردم، نەیدەزانی من بۆ ئەو ژوورە سەرکەوتووم.

"تۆ ئاژوانی، وای دابنێ لەناکاو پیاوێک دەبینی کە لە پشت دارەکانەوە دێتە دەر و بەرەو ڕێگەی ئاسن ڕا دەکا، لەو ساتەدا چ دەکەی؟"

سەرنجم نەدا کە ئەم پرسیارەم پرسی، ئەوەی ڕاستی بێ خۆی هاتە سەر زارم. **یەعقووب** هەوڵی دەدا وەڵامێک بدۆزێتەوە، کەچی نەیدەتوانی. وشەی گونجاوی بۆ نەدەدۆزرایەوە. ئەوەی ڕاستی بێ دەبوایە لە سەر شەپۆلەکان ئەم پرسیارەی لێ کرابا، دەبوایە من لە پشت دەزگایەک دانیشتبام و بە دوگمەیەک لێی

گەڕابام. لەگەڵ دۆزینەوەشیدا گوتبام: "ئەلۆ، ئەلۆ. ئەوە تۆی، کابرا شۆفیرەکە؟ پێم بڵێ چ دەکەی کاتێک شەمەندەفەرێک دەئاژۆی و پیاوێک دەبینی کە بە ڕاکردن دێ خۆی لە بندا درێژ بکا؟"

بە نۆرەی خۆم پێم وا بوو ئەمە شتێکی ساماناکە، دیارە وەڵامەکەیم دەزانی. **ئانێک** بۆی گێڕابوومەوە چ ڕووی داوە، **ئانێکی** هاوسەری پێشووی **ڕۆنێ**.

لە ڕێگەی پۆلیسێکەوە کە چووبووە شوێنی کارەساتەکە، وردەکارییەکانی بەسەرهاتەکەی دەزانی. پۆلیسەکە بەدەم هەڵکردنی ئاژیرەکەی تا شوێنی ڕووداوەکە ئۆتۆمبێلەکەی ئاژۆتبوو. دەبوایە لێپرسینەوەی لەگەڵ شۆفیرەکەدا بکردایە، جەستەی هەلاهەلابووی **ڕۆنێ** کاری وی نەبوو. ئەو ڕایگرتبوو و چاوێکی بە تەرمەکەدا خشاندبوو، پاشان بێتەلەکەی بەکار هێنابوو و بەدوای شۆفیرەکەدا هەتا لای شەمەندەفەرێکی بازرگانی ڕای کردبوو، کە کیلۆمەترێک دوور لەوێوە ڕای گرتبوو. بینیبووی کە دەرگەی شەمەندەفەرەکە کراوەیە؛ ڕاپۆرتی خۆی دابوو. "ئەلۆ... ئەوە گەیشتم. دەرگەکە کراوەیە، بەڵام شۆفیرەکە لە ژوورەکەی نییە."

بەرپرسەکە فەرمانی دابوو: "دیسان بگەڕێن! چاو بە دەوروبەردا بگێڕن."

پۆلیسەکە چووبوو دەوروبەری پشکنیبوو.

به بێتەڵەکەی گوتبووی: "هیچ نابینرێ. شۆفیرەکە ڕۆیشتووە."

بەرپرسەکەی دووبارەوە کردبووەوە: "دیسان بگەڕێن!"

پۆلیسەکە هەموو شوێنێک گەڕابوو، پشت پنچک و نێو دارەکان و قەراغ چۆمەکە.

- کەس نابینم، تەنانەت پشیلەیەک بەدی ناکرێ.

- بەردەوام بن! بە درێژایی ڕێگەی ئاسندا بڕۆنە پێش.

پۆلیسەکە بە قەراغ ڕێگەی ئاسندا هەڵاتبوو، کیلۆمەترێک پتر ڕۆیشتبوو.

- شوێنەواری شۆفیرەکە بەدی ناکرێ.

- دیسان هەوڵ بدەن. ئەم جارەش ئەگەر هیچتان نەدۆزییەوە دەتوانن بگەڕێنەوە.

پۆلیسەکە کیلۆمەترێکی تر هەڵاتبوو و دواجار شەپقەیەکی دۆزیبووەوە.

- شەپقەی شۆفیرەکە لێرە لە سەر ڕێگەی ئاسن کەوتووە.

- کەواتە بە دوایدا بگەڕێن!

چەند سەد مەترێک دوورتر، لە سەر ڕێگەکان تاپۆیەکی بینیبوو.

"پێم وابێ دۆزیمەوە، گوێم لێیە کەسێک دەگری."

بەرپرسەکە هاواری کردبوو: "وازی لێ بێنە، وازی لێ بێنە! ئێستا خۆم دەگەیەنم."

ده خولەک دواتر فەرماندە بەو پەڕی خێراییەوە گەیشتبوو، ئۆتۆمبێلەکەی هەندێک دووری شۆفێرەکە ڕاگرتبوو، بە ئەسپایی بەرەو لای ڕۆیشتبوو و دەستی لە سەر شانی دانابوو.

"دەتانەوێ بتانگەیەنمەوە ماڵێ؟"

شۆفێرەکە بە ئاماژەی سەر ڕەزامەندیی خۆی دەربڕی.

بە پێی ئەو چیرۆکەی **ئانێک** بۆی گێڕابوومەوە، هیچ نیشانەیەک نادۆزمەوە کە هەست بکەم ئەو کەسە **یەعقووب** بووە. ئەوەی ڕاستی بێ دەبوایە لێم پرسیبایە ئاخۆ هیچ زانیارییەکی سەبارەت بە بنەماڵەی شۆفێرەکە هەیە یان نا.

بۆ نموونە پرسیبام:

"ئاخۆ پیاوەکە ژنی هەبوو؟"

"لەگەڵ ژنەکەی دەژیا؟"

"کوڕی هەبوو؟"

"ژنەکەی هۆڵەندی بوو یان بێگانە؟"

پێویستە بگوترێ ژنەکەی **یەعقووب** پێستێکی تۆخی هەبوو، ڕەش نا، بەڵکو قاوەیی، قاوەییەکی ڕوون. لە وێنەیەکی ڕەنگیدا چاوم پێی کەوتبوو، هەفتەکانی یەکەم وێنەکە لە سەر ئاگردانەکە نەبوو و دواتر لەوێ دانرا.

ڕۆژێک لەوێ وێنەیەکی ڕەنگیم بینی، وێنەیەک کە تازە گیرابوو. لە نێو وێنەکەدا کەسێکی بێگانە و منداڵێکی تەمەن پانزە ساڵ دەبینران، کوڕێژگەکە بزەیەکی لە

سەر لێو بوو، بەڵام ژنەکە ڕواڵەتێکی شێلگیری هەبوو؛ یەکسەر هەستم کرد ئەوە ژنی **یەعقووب**ە.
تەنیا توانیم بپرسم: "**یەعقووب**، ژنەکەت لە کوێیە؟"

باوکم هەمیشە دەیگوت: "**بولفەزل**، تۆ شتەکان زۆر ئاڵۆز دەکەی."
من هیچ شتێکم ئاڵۆز نەدەکرد، ئەو چیرۆکەی بە بالای ڕووداوەکەمدا هەڵدەبەست، دەیگرتمە خۆ.
بەرەو دۆلابێکی شووشەیی هەنگاوم نا. دۆلابی **یەعقووب** نا، بەڵکو دۆلابێکی تر کە لە چەندین مانگ لەمەوپێشەوە لە سووچێکی ژوورەکە دانرابوو. دەرگەی دۆلابەکەم کردەوە، پڕ بوو لە جلی ژنان.
لە پڕێکدا **یەعقووب** لە ژوورەکەی سەرێرا هاواری کرد:
- **بولفەزل**!
- چ بووە؟
- خێرا وەرە! ئێرانییەک هەیە، یان شتێکی وەک ئێرانی. ڕەنگە عەرەب بێ.
بە پەلەپەل خۆم گەیاندە ژوورەکەی بنمیچی، هێدفۆنەکەم لێ وەرگرت و لە گوێم کرد.
"ئەلۆ... ئەلۆ، سەلام، سەلاموعەلەیکوم. کۆجا هەستی. مەن دەر هۆلەند. ئاریٚ. **بولفەزل**. ئامین. ئەز پا دەرئامەدەم ئەز فەرار."
بەڵام دەنگەکە ون بوو، هێدفۆنەکەم هەڵگرت.

- کێ بوو؟

- هاووڵاتییەک لە سەر شەپۆلەکان.

- چیی گوت؟

- بـــاش گـــوێم لە دەنگـــی نەدەبـــوو. دەنگـــی بـــاش نەدەبیسترا و کتوپڕ ون بوو.

## ٢٤

**یەعقووب** هێدیهێدی شوێنی بەتاڵی **ڕۆنی**ی پڕ کردەوە. ماڵەکە چیتر ماڵە بەتاڵەکەی **ڕۆنی** نەبوو، بەڵکو ئیتر ماڵی **یەعقووب** بوو. **ڕۆنی** هۆڵەندییەکی پەتی بوو، بەڵام لە ڕوانگەی منەوە **یەعقووب** وا نەبوو، هەروەها جیرانیش نەبوو؛ **یەعقووب** بوو و بەس. نەمدەتوانی خۆم وەک هاوڕێیەکی ئەو بێتە بەرچاو. دەمتوانی لە پەنا وی بە پێوە بوەستم. ئەو بە کاروباری خۆیەوە خەریک دەبوو و من بە هیی خۆمەوە. جارجارە ئەو لە ژوورەکەی سەرەوە بوو و من لە هیی خوارەوە، لە سەر مێزەکەی دادەنیشتم. نەیدەخواردەوە، بەڵام جارجارە هەڵدەکەوت پێکەوە دادەنیشتین.

- **یەعقووب**، تۆ شەمەندەفەری سەفەر دەئاژۆی یان هیی بازرگانی؟

- شەمەندەفەری سەفەر. جارجارەش شەمەندەفەری بازرگانی. بۆ؟

- بۆت گرنگە بزانی کێ لە شەمەندەفەرەکەدایە؟

- بەڵێ، نەخێر، بەڵام مەبەستت چییە؟

- مەبەستم ئەوەیە ئاخۆ لات گرنگە بزانی چ کەسانێک لە شەمەندەفەرەکەدان ئەو کاتە وا لێی دەخوڕی؟

وەڵامــی نەدامەوە و چــاوی لە مــن بــڕی. ڕەنــگە پرسیارێکی گەمژانە بێ، بۆچی دەبێ بۆ شۆفیرێ گرنگ بێ و بزانێ چ کەسانێک لە نێو شەمەندەفەرەکاندان؟

بـۆ شـۆفیرێک ڕێگەکـانی ئاسـن دەبـێ لە ڕێبوارەکـان گرنگتر بن، دواجار بۆ شۆفیرێک چ دەکا؟ پێویستی بە لێخوڕین نییە. شەمەندەفەر دەتوانێ بێ یارمەتیی هیچ کەسێ بە سەر ڕێگەکانی ئاسندا بڕوا، تا وێستگەکەی تر. شۆفیرێک هیچ نییە بیکا ئەوە نەبێ ئامێرەکە بخاتە گەڕ، هەروەها ڕایبگرێ؛ جارجارە شۆفیرەکان درەنگ شەمەندەفەرەکە ڕادەگرن.

- پرسیارێکی دیکەم هەیە یەعقووب.

- پرسیاری چی؟

- ئاخۆ بە لای ڕێبوارێکەوە گرنگە بزانێ کەسانی تری نێو شەمەندەفەرەکە کێن؟

- جا من چووزانم!

- تـۆ چـۆن بیـر دەکەیـتەوە؟ ئـاخۆ بـۆ ڕێبـوارێکی هۆڵەندی گرنگە بزانێ کەسانی تری نێو شەمەندەفەرەکە کێن؟

- چووزانم.

- ئەی خوایە، تۆ بۆچی هەر دەڵێی "چووزانم"؟

- دەتەوێ چیی ترت پێ بڵێم؟

- دەتـوانی بپرسـی: 'بـولفەزل، ئـاخۆ بە لاتەوە گـرنگە بزانی کێ لەگەڵ تۆ لە نێو شەمەندەفەردایە؟'

- باشە؛ ئاخۆ بە لاتەوە گرنگە بزانـی کێ لەگەڵ تۆ لە نێو شەمەندەفەردایە؟

- نـا، بەگشـتی نـا. بەڵام بەردەوام بە دوای کەسـێکدا وێڵم، چاوەڕێم لە نێو شـەمەندەفەردا تووشـی کەسـێک بم.

- دەتەوێ تووشی کێ بی؟

- نازانم. شتەکانم لە سەر مێزێک دادەنێم و دەگەڕێم.

چیتـر گـوێی لـێ نەدەگـرتم، گفتۆگـۆکە سـەرنجی ڕانەدەکێشا.

بەردەوام بووم:

- نـاتوانم پـێش بە خـۆم بگـرم، لە واگـۆنێکەوە بـۆ واگۆنێکی تر دەچم.

- بۆچی؟

- لە پیرەمێردێک دەگەڕێم، دڵم پێم دەڵێ دەبێ تووشـی پیرەمێردێـک بـم کە شـەپقەی لە سـەرە و گۆچـانی بە دەسـتەوەیە، پیرەمێردێـک کە لە تەنیشـت پەنـجەرە دانیشـتووە و سـەیری دەرەوە دەکـا. ڕۆژێـک لە سـەر مێزی یەکێک لە واگۆنە بچووکەکان چاوم بە شەپقەیەک کەوت، شـەپقەیەکی ڕەش لە سـەر مێزێکـی پڕتەقـاڵی. گۆچانێکیش بە قولاپێکەوە هەڵواسرابوو. بەڵام پیرەمێرد لەوێ نەبوو، واگۆنەکە بەتاڵ بوو. تا کۆتـایی سـەفەرەکە لە نێـو ڕاڕەوەکەدا چـاوەڕێ مـامەوە، کەچـی پیـاوەکە

نەهـات. کە دەبـوایە دابەزم، شـەپقەکەم بینـی هەر وا لە جێـی خـۆیەتی و گۆچـانەکەش هەر وا بە هەڵواسـراوی ماوەتەوە.

- ئەمە مەحـاڵە! شـتی ئـاوا ڕوو نـادەن. شـەپقەیەک و گۆچانێک لە واگۆنێکی بەتاڵدا! نـا، مەحـاڵە. لە شـوێنێکدا گرفت هەیە. ئاخۆ کۆنترۆڵچیت ئاگەدار کردەوە؟

- نەخێر، ئەو کارەم نەکرد.

- کارێکی هەڵەت کردووە، گەمژانەیە.

هەمـــدیس بێـــدەنگییەکی درێـــژ زاڵ بـــووەوە، لەگەڵ ئەوەشدا من پرسیارێکم هەبوو.

**یەعقووب**، ژنەکەت لە کوێیە؟

## ٢٥

ڕێبوارێک لە نێو تاریکیدا بەدەر کەوت.

شـتی هەرە گرنـگ بـۆ مـن چ بـوو؟ جانتـاکە یـاخود ژنەکە؟

جانتاکە.

نەخێر، ژنەکە.

جانتا، ژن و تاریکی.

ئەوەی ڕاسـتی بـێ، ئەوە شـێوازی هەڵسـوکەوتی بـوو سـەرنجی ڕادەکێشـام. لە نێـو بـاخچەکەی **یەعقـووب**، لەگەڵ تاریکاندا، ژنێک بە جانتایەکەوە بەدەر کەوت.

جانتاکەی لە سەر گیا شەختەگرتووەکەی پاییز دانا.

گوتم: "ئێوە دەبێ **مـاری ڕۆز** بن، هـاوژینی **یەعقووب**، ئێستاش گەڕاونەتەوە. **بولفەزلم**، من ناوم **بولفەزلە**."

کلیلی پێ نەبوو. دەمزانی کلیلی پێ نییە.

"**یەعقووب** لە سەر کارە، کلیلەکەتان بە منن. ماندوون؟ دەزانم، ئەم سەفەرە درێژە شەکەتی کردوون."

کلیلەکە لە گیرفانمدا بوو، بە سەر دیوارەکەدا چوومە ئەودیو و دەرگەکەم بۆ کردەوە.

جانتاکەیم هەڵگرت و فەرمووی ژوورەوەم کرد.

"ماوەیەکی درێژە نین."
ئەو پەتەم ڕاکێشا وا بە سەر مێزەکەدا شۆڕ ببووەوە. گڵۆپەکە هەڵبوو، ئێستا ئیتر ڕوخساریم دەبینی. ماری ڕۆز لە ژێر شۆقی چرادا، قژی خۆڵەمێشیی ڕەنگ بوو، درێژ و خۆڵەمێشی، تەواو خۆڵەمێشی نەبوو. هەردوو دەستی خستە بان سەری و ماوەیەک بەم جۆرە مایەوە. پاشان قژی سەری بە شێوەی کلکی ئەسپ گرێ دا.
"باوک مردوو، قژەکانم خۆڵەمێشی. من کات نەبوو قژم ڕەنگ لێ بدەم."
لێی تێدەگەیشتم و لێی تێنەدەگەیشتم، ئەو باش قسەی بۆ نەدەکرا. یەک دونیا هەڵەی ڕێزمانیی هەبوون، بەڵام بە دەنگێکی ئاهەنگین و شێوەزاری مەکسیکی قسەی دەکرد.
"باوک مردوو، کاتێک ئەمن لە نێو فڕۆکەدا."
کورسییەکم بۆ بردە پێش، دانیشت. من لە بەردەمی بە پێوە وەستام، دەیتوانی نائامادەیی بە گۆشەنیگایەکی تر پیشانی من بدا.
- تێگەیشتم چیتان گوت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانن دووبارەی بکەنەوە. ڕستەی فڕۆکەکە و باوکتان؟
- من دانیشتبوو لە نێو فڕۆکە لە کن پەنجەرە، باوک چاوەکانی نووقاو.
- باوکتان لە کوێ بوو؟
- لە ماڵێ، ئەو نووستبوو لە ماڵەوە. ئەمن لەو ماڵەدا لەدایک بوو.

- ئەی پاشان؟
- پاشان من لە ماڵەوە. باوک ڕۆیشت.
- ڕۆیشت؟
- لە نێو تابووت، هەڵگیرا بۆ گۆڕستان. من هەڵات بۆ سەر گۆڕی باوکم، بەڵام تابووتەکە بزمارڕێژ.
- بەداخەوە، ماری ڕۆز.

جانتاکەی لە سەر مێزەکە دانا، کردیەوە و وێنەیەکی لە چوارچێوەگیراوی پێ دام. وێنەی پیرەمێردێک کە گۆچانێکی پێ بوو و لە بن کۆنەدارێک لە سەر کورسییەک دانیشتبوو، دارەکە نسێی خستبووە سەر ڕوخساری. سەیری ئاسۆگەی دەکرد، وەک ئەوەی کەسێک لە دوورەوە سەرنجی بۆ لای خۆی ڕاکێشابێ، وەک ئەوەی کەسێک ئێستا نا ئێستا لە ئاسۆی دید بەدەر بکەوێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەس نەیەت.

- باوکتان چیی دەکرد؟
- جاران کەشتیی گەورەی دروست دەکردن، کەشتیی گەورە بۆ ئاوەکانی مەکزیک.

دەمزانی ماندووە، بەڵام دەمویست ڕێک لەو کاتەدا کە دوای سەفەرێکی درێژ پێی ناوەتە ماڵەکەی، پرسیارەکانمی لێ بکەم. لەو ساتەی وا یادەوەری بۆنی گەڵای ئەو پیرەدارەی لێ دەهات کە باوکی لە بنی دانیشتبوو، ڕێک لەو کاتەی وا دەست و ئەژنۆکانی بۆن و بەرامەی خاکی گۆڕەکەیان هەر وا پاراستبوو، لەو ساتەوەختەدا ئەو هێشتا بە تەواوی نەگەیشتبوو.

تـاوێکی تـر، کە **یەعقـووب** هـاتەوە مـاڵێ، مـاری ڕۆزی ڕێبوار دەبێتەوە بە **ماری ڕۆزی** هاوژینی **یەعقووب**.

- ئێوە چۆن **یەعقووب**تان ناسی؟ ئێوە کە مەکسیکین و **یەعقووب** کە هۆڵەندییە؟

-**یەعقووب** هاتە گوندی من، من بینیم لە دارستان. بابم گوتی: '**ماری ڕۆزی** من هاوڕێی نـابێ.' مـن گوت: 'بـابە، ئەمە چارەنووســـمە، وازم لــێ بێــنە بــڕۆم لەگەڵ ئەم شـۆفیرە. دەنێـرم نـامە لە **هۆڵەنـد**ەوە. ئەگەر ئەم شـۆفێر مێردێکـی خـراپ، تـۆ وەرە و **مـاریٚ ڕۆز** بێـنەوە.' بـابم ماچی کرد قژی من، خستی دەسـتی مـن لە نێو دەستی **یەعقووب**. من هاتم بۆ **هۆڵەند**، من و کوڕێک - **ماریۆزا**.

- **ماریۆزا** لە کوێیە؟

- **ماریۆزا** خەوت کۆتایی هەفتە لە ژووری بابم.

- لە **مەکسیکۆ**؟

- خوێنـــدنگەی فـــڕۆکەوان، **مـــاریۆزا** هەیەتـــی دوو پەســاپۆرت. دەیەوێ بـوو بە فـڕۆکەوان، لێـی بخـۆڕێ فڕۆکەیەکی گەورە. باب مـرد، نـاتوانێ ئیدی بە فـڕۆکەی گەورە لەگەڵ **ماریۆزا** بێتە ماڵی **ماری ڕۆز** لە **هۆڵەند**.

ســەبارەت بە بــاوکی دەمویســت هەنــدێک پرســیاری تـایبەتیی لـێ بکەم، سـەبارەت بەو کورسـییەی وا لە سەری دانیشتبوو، سەبارەت بە ئاڕاستەی ئەو شـوێنەی ڕووی تـێ کـردووە و نـوقمی ڕوانینێتـی، دەربـارەی ئەو ماڵەی سـووچێکی لە پشتەوەی وێنەکەوە دیـار بـوو؛ لـێ **ماری ڕۆز** ماندوو بوو.

گوتی:

- تۆ دەدەی بە من کوپێک قاوە؟

- هەڵبەت، کوپێک قاوە. هەق بە ئێوەیە، هیلاک و شەکەتن. ئاخۆ نانتان خواردووە **ماری ڕۆز**؟

بە پەلە چوومە ماڵی خۆمان، دەورییەکم دەست دایە و بەشە خۆراکی خۆمم تێ کرد تاکو بیدەم بە **ماری ڕۆز**.

مێزی خواردنم بۆ ئامادە کرد، دەورییە چێشتێک و کوپە قاوەیەک. پاشان کورسییەکم بۆ خۆم هێنا، لە بەرامبەری دانیشتم و سەرنجیم دا.

بەدەم خواردنەوە لە بیر و خەیالانڕا چوو.

کە قاوەکەی خواردەوە پاکەتە جگەرەیەکی دەرهێنا، بە نیگا لە تەپڵەکێک گەڕا، تەپڵەکێکم لە بەردەمی دانا. **یەعقووب** جگەرەی نەدەکێشا، من بۆچی. جارناجارێ دانەیەکم دادەگیرساند.

**ماری ڕۆز** بەستەیەک جگەرەی بەرگی مەکسیکی نیوەپڕی لە جانتاکەی دەرهێنا و گوتی:

- ئەم جگەرەیە بۆ تۆ؟

- بۆ من؟

- **یەعقووب** گوتی بە تەلەفۆن ئەتۆ دەکێشی جگەرەی بەرگ لە باخچەکە. باوکم چیتر جگەرەی نەکێشا، نەیتوانی.

هیچم نەگوت، تەنیا سەیری قژیم کرد، قژە خۆڵەمێشییەکەی کە بێگومان سبەی ڕەنگی دەکا. جگەرەیەکی بەرگم دەرهێنا و دام گیرساند.

گوتی:

- **یەعقووب** کەی دەگەڕێتەوە؟
- پێم وا بێ ئێستا نا تاوێکی تر دەگەڕێتەوە.

بە درێژایی شەو لە بەرامبەر **ماری ڕۆز** دانیشتم، هەتا هاتنی **یەعقووب** ئەو هەر وا چیرۆکی خۆی گێڕایەوە.

بەیانیی ڕۆژی دواتر **ماری ڕۆزێکی** تەڕ و تازە لە باخچەکە بەدی کرا، قژی چیتر خۆڵەمێشی نەبوو، بەڵکو خەنەیی بوو.

ژنەکەم نەیدەویست لەگەڵ ئەودا پەیوەندیی هەبێ.

ئەو دەیگوت: "هۆڵەندییەکەم ئازار دەچێژێ ئەگەر بمەوێ قسەی لەگەڵ بکەم."

**ماری ڕۆز** چۆن دەیتوانی هۆڵەندییەکەی پێش بخا لە کاتێکدا مێردەکەی بەردوام لە پشت جامی شەمەندەفەرێک بوو؟ یان خەریکی نووژەنکردنەوە؟ **یەعقووب** کەم قسەی لەگەڵ دەکرد و ڕستەی سادە و پچڕپچڕی بەکار دێنا.

"من، لە سەرێ، **ماری**."

"من، کار، **ماری**."

"من، دەخەوم، **ماری**."

"ئانتێن، لەکار کەوتووە، **ماری**."

"من، لە لای دایکم نان دەخۆم، **ماری**."

ئەویش بە مەکسیکی دەیدواند.

بەڵام من و ئەو سەبارەت بە گەلێک شت بە هۆڵەندی پێکەوە قسەمان دەکرد، شێوازێکی تایبەتی هۆڵەندی کە تەنیا خۆمان دەمانتوانی لێی تێبگەین.

کاتێک ماری ڕۆز هات چیتر پەیوەندیم لەگەڵ **یەعقووب**دا نەما، لە ژوورەکەی سەرێ دەخزا و من و ماری لە هۆڵەکەی خوارەوە دەماینەوە. ئەو شەوانەی درەنگ دەگەڕایەوە ئێمە سەری بوتڵێکمان هەڵدەپچڕی، یەک بە دوای یەک پەرداخەکانمان دادەگرت و قسەمان دەکرد. ئێستا باش دەمزانی دێهاتەی زێدی ئەو لە کوێ هەڵکەوتووە، دارستانەکە لە کوێیە و ڕێوییەکانی چەندە فێڵبازن، یان چۆن کە قالاوی پیر ئەجەلی هات لە سەر لقی دارێکەوە کەوت، باوکی چۆناوچۆن دایکی ناسیبوو، یان چما دایکی لە تافی لاویدا مردبوو، دەمزانی خودا مەکسیکییەکەی گشت ئەم بڕیارانەی داوە و مرۆڤ چۆن دەبێ ملکەچی ویستی ئەو بێ. ئێستا دەمزانی دواجار ڕۆژێ دادێ **یەعقووب** چیتر پێویستی بەوە نابێ بچێتە سەر ڕێگەکانی ئاسن، ئەوسا ئانتێنەکەی دەپێچێتەوە و لە مەکسیک، لە گوندی ژنەکەی نیشتەجێ دەبێ. دەمزانی خودا مەکسیکییەکەی وا دەخوازێ، **ماریۆزا**ش دەبێتە فڕۆکەوانێکی گەورە؛ ڕۆژێک بە فڕۆکەیەکی گەورە بە سەر ئاسمانی گوندەکەیاندا دەفڕێ، ئینجا **ماری ڕۆز** و **یەعقووب** دەستیان ڕادەوەشێنن و لە خۆشیان دەقیژێنن. وەلێ ئێستا **ماری** دەبێ چاوەڕێ بێ و **یەعقووب** چەندین و چەندین ساڵی تر لە ڕێگەی ئاسندا کار بکا و چەندین و چەندین ساڵی تر لە سەر شەپۆلەکان بە دوای خەڵکیدا بگەڕێ.

## ٢٦

کـــاتژمێری دیـــواری ژوورەکەی ڕۆنیشـــتنمان بـــێ پسـانەوە دەسـحێبی زەمەنـی دەگێـڕا، زەمەنـیش منـی دەگـۆڕی. لە وڵاتەکەی خـۆم ژیـانم بە پێـی پلانێکـی لە پێشـدا دیـاریکراو تێـدەپەڕی، هەمـوو شـتێک لە لایەن جـووڵانەوەی خـۆڕاگرییەوە جێبەجـێ دەکـرا کە مـن بەشـێک بـووم لێـی. دەبـوایە بەردەوام ملکەچـی ئەو فەرمانـانە بـم کە لە سـەرەوە دەردەکـران، دەبـوایە تـا گەیشتن بەو ئامانجەی حزب دیاری کردبوو پەیڕەوی لە فەرمانەکـان بـکەم. لەگەڵ ئەوەشـدا ملکەچـی هـیچ ئەنجامێـک نەدەبـووین. کەسـانێکی زۆر مـردن، چەنـد خەباتگێڕێـک توانیـان خۆیـان ڕزگـار بـکەن. کە هـاتمە **هۆڵەندا** ویستم ببمەوە بە خۆم، ماڵئاوایی لە هەموو ئەو فەرمانـانە بـکەم. تەنیـا ئەرکێـک کە لە سـەر خـۆم دەمپەژراند، ئەوە بوو کە خۆم دەمسـەپاند. بە واتـایەکی تر، نەمدەویست جگە لە هەڵاتن پەیڕەوی لە هیچ شتێکی تر بکەم.

سـەرجەم ئەو شـتانەی لە پـاش خـۆم جـێم هێشـتن بەسوێ بوون، بەڵام ئەمە تەنیـا پەیوەنـدیی بە ئـازارەوە

هەبوو. تێگەیشتبووم بهێڵم ژیانم ڕەوتی خۆی تەی بکا. جاران ماڵێکی باو و کاڵان هەبوو، ئێستا ئەو ماڵە چیتر نەماوە، ماڵەکە ب سەروشوێن ببوو.

جاران ڕۆنی ناوێک هەبوو، ئێستا ئیتر نەماوە. جارێک دایکم بە جانتایەکەوە هات و من نەمدەزانی قیبلە ڕووی لە کوێیە؛ کەڵەبابەکە ون ببوو، بەڵام گرنگ نەبوو. تەنانەت کاتێک ئاسمان لێڵ دەبوو نەمدەزانی موسڵمانێک ئەگەر ویستی نوێژ بکا، دەبێ ڕوو بکاتە کوێ. بەڵام ئەمە چیتر پێویست نەبوو. من ئیتر باوکم نەبوو و دایکیشم چیتر نەیدەتوانی بەرەو لای من بفڕێ. وازم دەهێنا ژیانم ڕەوتی خۆی بگرێتە بەر. دەمزانی کاتی هاتنی فڕۆکەیەک نزیک بووەتەوە، فڕۆکەیەک کە ڕۆژێک دەبێ بنیشێ.

ماری ڕۆز نزای بۆ دەکردم، داوای لە خودا مەکسیکییەکەی کردبوو ئاگەدارم بێ. بەڵام بەر لەوەی خوداکەی بتوانێ بمپارێزێ، من تا دووماهیی ئەزموونی تاڵی هەڵاتن پاڵ پێوە نرابووم.

هەڵاتن هیچ نییە جگە لە گەڕانەوە بەرەو ئەو شوێنەی لێی دەڕۆی. ئەوەی ڕاستی بێ هەرگیز ڕاناکەین، بەڵکو بەردەوام لە سەر ڕێگەی گەڕانەوەین. ڕۆیشتن بوونی نییە، گەڕانەوە بەڵێ. مرۆڤ دەفڕێ، بەرز دەفڕێ، بەڵام لەو شوێنە دەکەوێتەوە کە جێی هێشتووە. هەرچەندەش ئەمە یاسای هەڵاتن بێ، حەزم نەدەکرد لە هەمان شوێن بکەومەوە. دەمویست درێژە بە فڕین بدەم، هەلی

ناسینی نەتەوەیەکی نوێم بۆ ڕەخسابوو؛ پیاوان و ژنانی ئەم نەتەوەیە تەنیا **ڕۆنی**، **یەعقووب** و **ماری ڕۆز** نەبوون. دەمزانی تووشم بە تووشی پیاوانی تر دەبێ، ژنانی تر دەناسم کە بە دڵنیاییەوە لەوانی تر ناچن.

لە ئاوێنەدا چەند تاڵە قژێکی خۆڵەمێشیم لە سەر لاجانگەکانم بەدی کرد. نەخێر، وەرزەکان نەیاندەتوانی ڕابوەستن، وەک هەورەتریشقە دەهاتن و دەچوون. هەورەکانی **هۆڵەندا** سەرلەنوێ تێک دەهاڵان تاکو بەرگەی سەرما بگرن، ئاگردانەکان دیسان بڵێسەیان هاتەوە. پێش ئەوەی خودای مەکسیکی شتێک دابێنێ تاکو ئاواتەکانی **ماری ڕۆز** بەدی بێنێ، **ماری ڕۆز** چاکەتە درێژەکەی لە بەر کرد، شاڵە مەکسیکییەکەی بە خۆیدا دا، هاتە نێو باخچەکە و هاواری کرد: "**بولفەزل**! تۆ هات دەورێک لێ دەین؟"

چاکەتەکەم لە بەر کرد، پاسکیلەکەم هێنایە دەرێ و پێکەوە چووینە سەردانی دایکە پیرەکەی **یەعقووب**.

لە سەر بەنداوەکە بایەکی بەهێز هەڵی کردبوو، بەڵام گرنگ نەبوو. من تەنیا دەبوایە بە دوای **ماری ڕۆزدا** پێداڵ لێ بدەم.

لە کۆتایی بەنداوەکە مەزرا خۆی دەنواند، لە دوورەوە لە ماڵی مرۆڤە وردیلەکانی **سنوو وایت** دەچوو.

لە پێش ماڵەکە بەنداو هەبوو و لە پشتەوەی بەنداوەکەش ڕووبارێک بە ئارامی دەخووشی.

مــن زۆر جــار بە پاســکیل بە بەردەم ئەم مەزرایەدا تێــپەڕ ببــووم، هەروەهــا ژنە پیرەکەشــم دەناســی؛ بەردەوام دەمبینی لە سەر قەنەفەیەک لە پشت پەنجەرە دانیشــتووە، بەدەم پێــداڵ لێــدانەوە دەســتێکم بــۆ ڕادەوەشاند. سەیرم نەدەکرد، نەمدەزانی داخوا ئەویش بە ئاماژە وەڵامم دەداتەوە یان نا.

مــاڵۆچکەکە بەردەوام ســەرنجی ڕادەکێشــام، ڕەنــگە لەبەر ئەوە بــێ ژنەکە لە پشــت پەنــجەرە دادەنیشــت، ڕەنگە لەبەر ئەوە بێ پەردەکان نیوە لا درابوون، یان ڕەنــگە دووکەڵ، دووکەڵــی ئەو زۆپــایە منــی بەرەو ئەو ماڵە ڕاکێشــابێ، دووکەڵێ کە ئــاگردانی جــێ دەهێشــت و ساتێک وێڵ دەمایەوە و پاشان ون دەبوو.

**ماری ڕۆز** گوتی: "بە ئێرەدا."

پــاڵم بە پاسکیلەکەمەوە نــا و بەدویدا بە ســەر ڕێگەی دەربازبوونــدا شــۆڕ بــوومەوە، کەڵەبــابێکی ڕەنگاوڕەنــگ بــازی دایە ســەر دیوارێــک و قووقانــدی: "ئــاگەدار بە! ئاگەدار بە! بێگانەیەک دێتە نێو بازنەوە!"

پاســکیلەکەم بە نێــوقەدی دارێــکەوە نــا کە لە بەردەم مەزراکە شــین ببووەوە، پیرەژنەکە لە هەیــوانەوە بەدەر کەوت. ئاخ! خۆیەتی. بۆ یەکەم جار، بێ ئەوەی پەنــجەرە بکەوێــتە نێوانمــانەوە، لە نــزیکەوە دەمبینــی. نــازانم لە کــوێ، بەڵام هەســتم دەکــرد ڕۆژێــک لە شــوێنێکی تــر تووشی بووم.

"ڕۆژباش خاتوون! ئەمن **بولفەزلم**، ناوم **بولفەزلە**."

لەو ساتەی وا دەستیم دەگوشی، کتوپڕ نیگام نیشتە سەر کۆمەڵێک کۆلکەداری کەڵەکەکراو لە سووچێکی هەیوانەکە.

پیرەژنەکە گوتی: "فەرموو کاکە!"

ساتێک لە لای کەلوپەلەکان ڕاوەستام.

**ماری ڕۆز** گوتی: "فەرمووا دەرەوە زۆر ساردە."

وە ژوور کەوتم. زۆپاکە دایسا، چا لە سەر زۆپاکە حازر بوو. گەرمای ژووری بۆنی هەڵووژەی وشکی بەو ناوەدا بڵاو کردبووەوە. لە سەر ئاگردانەکە چەند وێنەیەکی ڕەش و سپیی دوو کەسی بەساڵداچوو دەبینران، کە شەپقەیەکیان لەسەر بوو.

پیرەژنەکە گوتی: "فەرموون دانیشن کاکە!"

چاکەتەکەم بە بزمارێکی کۆنەوە هەڵواسی. بەرەو پەنجەرەکە چووم، پەردەکانم لا دا و دانیشتم.

گوێم لێ بوو **ماری ڕۆز** گوتی: "**بولفەزل** ئەتۆش چا؟"

دەمویست لەوێ بۆ هەتاهەتایە دابنیشم، سەیری دەرەوە بکەم و چاوەڕێ بمێنمەوە.

پاسکیلسوارێک بە پێچەوانەی با بەرەو کۆتایی بەنداوەکە پێداڵی لێ دەدا،

گوێم لێ بوو **ماری ڕۆز** گوتی: "نا، شەکر نا بۆ **بولفەزل**."

پیرەژنەکە پیاڵەچایەکی بۆ ڕاداشتم و گوتی: "ئێوە بە هۆڵەندی قسە دەکەن؟"

بە خۆمم گوت ئەم دەنگە دەناسمەوە.

**ماری ڕۆز** گوتی: "توند قسە بکە، باش نەیبیست."
هیچم بۆ گوتن پێ نەبوو، بەس حەزم دەکرد دابنیشم و بنوارم.
**ماری ڕۆز** بە دەنگێکی بەرز پێی گوت: "ئەو باشتر لە من قسەی کرد بە هۆڵەندی."
کۆلکەدارەکان سەرەتا گڕێکی شینیان لێ بەرز دەبووەوە، شینێکی تۆخ و پاشان سوور و لەناکاو دوکەڵێکی تەنک لە زۆپاکە چووە دەرێ.
پیرەژنەکە گوتی: "خودای من!"
دەرگەی زۆپاکەی کردەوە و بە بێلچەیەک هەندێک پیلووی دەرهێنا و خستنیە ناو سەتڵێکەوە.
کۆلکەدارێکی خستە نێو ئاگرەکەوە و گوتی: "ئەوجا گڕەکە خۆشتر دەبێ."
مێزەکەی کە لە داربەڕوویەکی کۆن دروست کرابوو، بە فەرشێکی کاڵەوەبووی ئێرانی داپۆشرابوو.
"ئەم فەرشە هیی کوێیە خاتوون؟"
کاردانەوەیەکی ئەوتۆی پیشان نەدا، گوێی بۆ **ماری ڕۆز** ڕاداشتبوو کە باسی گوندەکەی خۆیانی بۆ دەکرد.
لە قوژبنێکی ژوورەکە قەرەوێڵەیەک هەبوو. ئەو پلیکانانەی دەچوونە نهۆمی سەرەوە سەرنجیان ڕاکێشام، چینێک تۆز داپۆشیبوون.
بە دەنگێکی بەرز گوتم: "پلیکانەکان، ژوورەکانی خەوتنی نهۆمی سەرەوە، ئاخۆ ڕێگەم پێ دەدەن چاوێک بە سەرێدا بخشێنم؟"

پیرەژنەکە پرسی:

- ئەم کاکەیە چی گوت؟

- **بولفەزل** تەماشای سەرەوەی کرد، ئەگەر مۆڵەت.

بە ئاماژەی سەر پەژراندی: "بەڵێ، با سەیری بکا."

بە دڕدۆنگییەوە ساتێک لە بەردەم پلیکانەکان ڕاوەستام، نەمدەویست چینی تۆزەکە بشکێنم. بە هێمنی قاچی چەپم لەسەر پلیکانەی یەکەم دانا، پاشان بە پارێزەوە سەرکەوتم. زۆر لەمەوپێش، زۆر زۆر لەمەوپێش، ئەودەم هێشتا کوڕیژگە بووم، بەم جۆرە بە پلیکانەکاندا سەردەکەوتم و دەچوومە ژووری کاری باوەگەورەم. ئەگەر بۆ خۆی لەوێ بوایە، کەس مافی نەبوو ڕووی تێ بکا. بێ هەست و خوست دەچوومە پشت دەرگەی ژوورەکەی، بۆنی جگەرەکەیم هەڵدەمشت. بە ئەسپایی دەرگەکەم دەکردەوە و سەرم دەبردە ژوورەوە؛ مێزێکی قاوەیی، کتێبخانەیەک، کۆمەڵێک کاغەزی کۆن، گۆچانێک، دۆلابێک، کورسییەک، مەودایەکی بەتاڵ و پەنجەرەیەک.

وە ژوور کەوتم، شۆڕ بوومەوە و لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرێم کرد، پاسکیلسوارەکە ڕێگەی گەڕانەوەی گرتبووە بەرەو **ئەیسێل** بە لۆژەلۆژ دەخووشی.

## ٢٧

**ماری ڕۆز** چ شتێکی بۆ من دەگەیاند؟

هیــوا؟ ئــارامی؟ ژن؟ ژنێــک کە هەرکــات ویســتبام دەمتــوانی ســەر بــکەمە ســەر ئەژنۆکــانی، یــاخود کەســـایەتییەک بـــوو لە نێـــو چیرۆکـــی مەنفامـــدا؟ کەســایەتییەک کە هــاتبووە ژیــانمەوە بــۆ ئەوەی بتــوانم ئاسانتر بەرگەی گۆڕانکارییەکــان بگــرم؟ وەرچەرخــانی **بولفەزل**ێکی کۆن بۆ **بولفەزل**ی نوێ،

لەو ســاتەوەختەی وا تاکوتەنیــا لە بەرامــبەر زەمەن ڕاوەستابووم، **ماری ڕۆز** هات تاکو دەستم بگرێ.

مەنفا زەمەنی تــایبەت بە خــۆی هەیە؛ مانــگ خێرا پیر دەبێ و مانگێکی گەنج خێرا لە ســەر خۆڵەمێشــی مــانگە کۆنەکە دەگەشێتەوە، قژی ڕەش زوو چەرمــگ دەبن و کچۆڵەکان لە چاوترووکانێکدا گەنج دەبن.

ڕابردوو نابزوێ و دادەکشــێ، بەڵام تۆ نــا. ئەو کەســەی لە مــاڵێ بمێنێــتەوە دەبینــێ هەمــان قەلەڕەشــە هەمــوو ڕۆژێ لە سەر دارەکەی هەڵدەنیشــێ، بەڵام ئەو کەســەی وا ڕادەکــا لە ئاســۆدا فڕۆکەیەکــی گەورە دەبینــێ کە ڕێبوارەکان دەگوازێتەوە.

له هیچ و خۆڕایی نەبوو کە پەیژەکەی **ماری ڕۆز** بە دیواری گەنجینەکەوە نرابوو و ئامادەی خزمەتگوزاری بوو. کاتێک پێکێک زیاتر لە جارانمان دەخواردەوە گومانەکانمان دەڕەوینەوە، دەمانزانی شەوێک فڕۆکەکە دێ، شـــەوێک کە مانـــگ بە تەواوی لە ئاســـماندا بدرەوشێتەوە. لە خۆڕا نەبوو لەگەڵ دەرکەوتنی مانگی تەواودا پەردەکانمان لا دەدا، ئێمە پێک هاتبووین. ئەگەر هات و **ماری ڕۆز** توانی لە نێو ئەستێرەکاندا ڕاشکاوانە فــڕۆکەکە دەســت پیشـــان بکـــا، بە پەلە دەهـــاتە نێـو باخچەکە و یەک بە خۆی هاواری دەکرد: "**بولفەزل!** فڕۆکەکە!"

ئەوسا مـن بە غـاردان دەچـمە خـوارێ، بە ســەر پەرژینەکەدا باز دەدەم و پەیژەکە دەگرم بۆ ئەوەی **ماری ڕۆز** بتوانێ بۆ سەر بانیژەکە سەرکەوێ. ئینجا منیش دەچمە سەرێ و تێکڕا هاوار دەکەین: "هیپ، هیپ، **ماریۆزا!** هووڕا **ماریۆزا!**"

قسەی خۆمان دەبەینە سەر، **ماری ڕۆز** بە کوڕەکەی دەڵـێ: "فــڕۆکەکەت هەڵـکە تـا بفـڕی بـۆ ســەر مــاڵی **بولفەزل**، دایکی چاوەڕێیە تەنیا."

ئینجا بەرەو گوند و زێدی من دەفڕین. پاشان **ماریۆزا** بە فڕۆکە گەورەکەی دوو سێ خوول بە بان گوندەکەی مندا لێ دەدا، بە دڵنیاییەوە دایکم نازانێ کێ لە نێو فڕۆکەکەدایە. **ماریۆزاش** ڕێک لە ژوور ماڵەکەی ئێمە دەفڕێ، تا ئەو ساتەی دایکم لە پەنجەرەڕا سەیری

دەرەوە دەکا. ئەوجا من بە دەلاقەیەکدا ئەو کراسەی بۆ فڕێ دەدەم کە بۆ ئەوم کڕیوە، دەستم ڕادەوەشێنم و هاوار دەکەم: "سڵاو دایە! سڵاو!"

دەمێکی درێژە هیچ نامەیەکم لە دایکمەوە پێ نەگەیشتووە، تەنانەت وشەیەکیش لە نیشتمانەوە نەهاتووە. سەرەتا هەموان نامەت بۆ دەنووسن؛ دایکت، خوشکەکانت و براکەت، تەنانەت ئامۆزا و میمکەزا و هاوڕێیانی پێشووت. هەموویان دەڵێن تاسەیان کردووی، بیری هەموویان دەکەی. بۆت دەنووسن کە ناتوانن بە نەبوونت ڕابێن، کە بۆشاییەکت جێ هێشتووە. تۆش دەنووسی کە لە بیریاندای، خەونیان پێوە دەبینی. بۆت دەنووسن چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەن تۆ بگەڕێیەوە. بۆیان دەنووسی: "دەگەڕێمەوە، بەڵێن بێ." هیچ گومانێک سەبارەت ناخاتە سەر ئەم بەڵێنە. پێ دادەگری کە ناکرێ لێرە بمری، "دەمەوێ لە وڵاتی خۆم بنێژرێم، لە نیشتمانی خۆم."

داوای وێنەیەکی نوێت لێ دەکەن، وێنەیەکیان بۆ دەنێری کە لە باخچەکەی پشت ماڵەوە گیراوە. هەر کە کات تێدەپەڕێ ژمارەی نامەکان کەمتر دەبنەوە، ماوەیەکی درێژە لە پێش چاویان نەماوی. دواجار چیتر نامەت بەدەست ناگا.

جاران دەچوومە پشت پەنجەرەکە و چاوەڕێ دەمامەوە پۆستەچی بێ، لە میلەکانی کاتژمێرەکەی دیوارم دەڕوانی تا ئەو ساتەی دەهات. دەیزانی

چاوەڕێی دەکەم، لە نێو کۆڵێک نامەدا چەند دانەیەکی دەردەهێنا، کە ڕەنگیان لەوانی تر نەدەچوو، منیش بەرەو دەرگەکە ڕام دەکرد.

هێدی‌هێدی پۆستەچی ئەو پێگە گرنگەی نەما کە لە ژیانی مندا زەوتی کردبوو، چیتر ڕۆڵێکی ئەوتۆی لە نێوان ڕابردوو و ئێستای مندا نەدەبینی؛ پسووڵە و نامەکانی شارەوانیی دەخستە نێو سندووقی پۆستەکەم و دەڕۆیشت.

بەیانییەک کە چاوەڕوانی نامە نەبووم، بینیم پۆستەچی بە خۆی و پاسکیلەکەیەوە لە ماڵەوە نزیک بووەوە. پاسکیلەکەی ڕاگرت و کارت پۆستاڵێکی دەرهێنا کە خرابووە نێو زەرفی نامەوە، کارتێک بە وێنەی گوڵە بەهارییەکانەوە.

"تۆ بوویتە چل ساڵ؛ ساڵڕۆژی لەدایکبوونت پیرۆز بێ. **میراندا.**"

چل ساڵ؟! من چل ساڵم تەمەن بوو؟ ساڵڕۆژی لەدایکبوونی من بوو؟ بە پێی ڕێکەوتی هەتاویێ من ساڵی ١٣٣٣ لەدایک‌بووم، کەوابێ مەحاڵ بوو.

پیاوانی بنەماڵەی ئێمە پێویستیان بەوە نەبوو بزانن چەند ساڵیان تەمەنە.

ئەم **میراندایە** دەبێ کێ بێ؟ **میراندای گرۆنینگ.**

ئەها! خۆیەتی، **ڕۆنی**. **ڕۆنی** بەردەوام باسی **میرانداکەی** دەکرد. هاوسەری پێشووی **ڕۆنی** جارێک باسی **میرانداکەی** کردبوو. کچی **ڕۆنی** کارتێکی بۆ

ناردبووم. **ڕۆنی** ڕۆژی لەدایکبوونمی دەزانی. ڕۆژی لەدایکبوونمی، جا بە هەڵە بێ یان ڕاست، لە ڕۆژژمێرێکدا یادداشت کردبوو. **میەتراش** دەیویست لەگەڵم لە پەیوەندیدا بێ، ناونیشان و ژمارە تەلەفۆنی خۆی نووسیبوو.

بۆ یەکەم جار پیاوێکی بنەماڵەی ئێمە لە ژنێکەوە کارت و ژمارە تەلەفۆنی پێ دەگەیشت.

شەپقەکەم لە سەر کرد و سواری شەمەندەفەری **گرۆنینگ** بووم.

لە **گرۆنینگ** ماوەیەکی زۆر وێڵ نەبووم، هەموو کەس دەیزانی تەلارە بەرزەکە لە کوێ هەڵکەوتووە. چوومە ماڵەکەی بەر لەوەی پێشوەخت ئاگەداری بکەمەوە؛ شایەتحاڵەتێک وادەی دیدار دیاری ناکا، وادەکان لەگەڵ ڕاکردندا ناگونجێن. کە لە هەڵاتندای تەلەفۆن بۆ خەڵکی ناکەی، بەڵکو تووشت بە تووشیان دەبێ. جا هەڵاتن کە شتێکی بێزراوە، بۆ شتێکی سەرنجڕاکێش دەگۆڕدرێ.

کاتژمێر دە و چوار خولەکی بەیانی بوو، دوگمەی زەنگی دەرگەکەم داگرت.

دەنگێکی ژنانە گوتی: "کێیە؟"

ساتێک دڕدۆنگی بەسەرمدا زاڵ بوو، زۆر زوو بوو بۆ ئەوەی چاوت بە کەسێکی نامۆ بکەوێ.

- سڵاو. منم، **بولفەزل**.

- **بولفەزل**؟ ئێ، **بولفەزل**.

وای گوت و ساتێک بێدەنگ بوو. ئینجا بەردەوام بوو: "فەرموون، تکا دەکەم."

زیاتر حەزم دەکرد کاتژمێر نۆ کەم پێنج خولەک، کاتژمێر هەشت کەم چوار خولەک یان کاتژمێر حەوت و شازدە خولەک لە دەرگەی ماڵەکەی بدەم؛ لەو ساتەی وا هێشتا لە خەو هەڵنەستابێ.

من تەنیا دیمەنێکم لەو لە مێشکدا بوو لە **میەترا**، کە هەڵووژەیەکی شینی بۆ دایکم ڕاداشتبوو.

نا، هەڵووژەکەی پێ نەدابوو، لێ گەڕابوو هەڵووژەکە بکەوێتە نێو لەپی دەستەکانی دایکمەوە.

لە نهۆمی حەڤدەیەم لە ئاسانبەر لە دالانێکی چۆڵ، کە دەرگەکانی داخرابوون، هاتمە دەرێ. لە بەردەم دەرگەی ژمارە ٩٤، حەزم دەکرد ئاوێنەیەک هەبێ؛ دەمویست ڕواڵەتی پیاوێکی ماڵی خۆمان ببینم لەو کاتەی وا بەرەبەیان دەرگەی ماڵی ژنێکی هۆڵەندی دەکوتێ، ژنێکی گەنجی گۆشتن لە نیوەتاکی دەرگەکەوە بەدەر کەوت.

نیگام کتوپڕ کەوتە سەر ڕیزی دوگمەکانی بلووزەکەی، ئەو دوگمانەی لە قورقوڕچکەیەوە دەهاتنە خوار و بە نێو مەمکەکانیدا شۆڕ دەبوونەوە؛ شەپۆلێک خوێنی گەرم لە نێو دەمارەکانمدا هەڵچوو.

لە بەر خۆمەوە گوتم: "ڕۆژباش. سەرەتا دەمویست تەلەفۆنتان بۆ بکەم، وادەیەک وەربگرم، بەڵام..."

ئەو گوتی: "فەرموون."

دەنگەکە دەنگی ژنێک بوو، چیتر ئەو میەترایە نەبوو کە دەمناسی.

چـــوومە ژووری، بەرەو ئەو پەنـــجەرەیە چـــووم کە دەیڕوانییە دارستان. لە دوور شەمەندەفەرێکی بارهەڵگر وێـستگەی جێهێشـت، بە دەنگەدەنـگ و هاڕەهـاڕ ڕاسـت بەرەو بینـاکە دەهـات. ئـاخ! شـەمەندەفەرەکان چیتـر لە ڕۆیشتندا نەبوون و من نەمدەزانی.

شـــەمەندەفەرەکان لە نێـــو خەونەکـــانی منـــدا خێـــرا دەڕۆیشـتن، سـامناکانە خێـرا. هەموویـان لە یەک کاتـدا دەگەیشتن و مۆتەکەیان پێ دەدام.

بەڵام لەناکاو بۆم دەرکەوت کە ئیتـر شـەمەندەفەرەکان نەماون.

دوایین شەمەندەفەر کەی وازی لێ هێناوم؟

ئـــاخۆ لەو ڕۆژەدا بـــوو کە مـــاری **ڕۆز** لە ســـەفەر گەڕایەوە؟

یـان تـۆ بڵێـی ئەو سـاتەوەختە دوایـین شـەمەندەفەر ڕۆیشتبێ، کە لە بەردەم ئاوێنەی دۆڵابەکە خۆی ڕووت کردەوە و من سەیرم دەکرد؟

شەمەندەفەرەکان بێ ئاگەداری پێشوەخت ڕۆیشتبوون، ئێستا **ڕۆنی** پێدەکەنی.

مـــن وێـــڕای ئامـــاژەکردن بەو وێـــنەیەی لە ســـەر ئاگردانەکە دانرابوو، گوتم: "**ڕۆنی**م نەبینیوە پێبکەنێ."

**میراندا** پرسی:

- بەڕاست؟

- بەڕاست.

گوتی: "تۆ لەو ساڵانە ناسیت کە لە دۆخێکی خراپدا بوو؛ بەردەوام خۆشحاڵ بوو، باوکێکی باش بوو."

سەیریم کرد.

گوتی:

- من ڕاستگۆم، ئەو باوکێکی باش بوو بۆ من.

- کتوپڕ کەوتە نێو دۆخێکی خراپەوە؟

- نازانم. تێناگەم. من منداڵ بووم، نەمدەزانی چ دەقەومێ.

- لەناکاو بینیت دایکت دەڕوا و **مۆکا مۆکا** جێگەی دێ.

- **مۆکا مۆکا**؟ **مۆکا مۆکا** کێیە؟

- ئەها! ببوورە. باسی هاوڕێکەی باوکت دەکەم، ئەو پیاوە کورتەباڵایەی جارجارە لە ماڵی ئێوە دەژیا.

- ئەها، ئەو کابرایە.

پاشان نەمزانی ئیتر چی بڵێم، لەبیرم چووەوە باسی چیم دەکرد. پێم وا بوو ئێستا نا ئێستا لێم دەپرسێ بەو بەیانییە لە **گرۆنینگ** چ دەکەم، دەمویست بیانوویەکی ئامادەکراوم هەبێ.

"بە هەڵکەوت بوو، بە هەڵکەوت بوو وا هاتم بۆ بینینت. ئەمشەو لە ماڵی هاوڕێیەک لەو دەوروبەرانە بووم، دەمویست بگەڕێمەوە ماڵێ و لەناکاو بیرۆکەیەکم بە مێشک گەیشت: خۆ دەتوانم سەردانی **میرانداش** بکەم."

نا، من درۆم نەدەکرد، من بەدوویدا نەگەڕابووم. ئەوەی ڕاستی بێ، ئامانجم بینینی وی نەبوو. من باوک

بـووم، بـاوکی بنەمـاڵەیەکی تێکشـکاو. مـن تەنیـا لە قوژبنێکی یادەوەرییەکانمدا ڕام گرتبوو، ڕێک وەک ئەو کەنیشـکە گەنـجەی سـاڵانی گەنجێتـیم، ئەو کەنیشـکە گەنـجە لە ڕابـردووی منـدا مـابووەوە. مـن نـامەم بـۆ نەدەنـارد، ئەویـش نـامەی بـۆ نەنـاردبووم. نامەنـاردن مەحاڵ بوو، پێچەوانەی دابونەریتی نیشتمانی من بوو. بەدەم ڕێوە لە خۆمم دەپرسـی **میراندا** بۆچی کارتی بـۆ نـاردووم؟ ڕەنـگە بیەوێ هەلـی گفتوگۆیەک بڕەخسـێنێ، دیدارێک ڕێک بخا کە لەوانەیە چوار یان پێنج سـاڵی تـر بێـــتە دی. خـــۆم بە ناچـــار دەبینـــی بە پیـــر دەستپێشخەرییەکەیەوە بچم.

پرسی:

- کوپێک قاوەت بۆ تێبکەم؟

- بە خۆشحاڵییەوە.

وام گـوت و ویسـتم شـتێکی تـریش بڵـێم کە بەرەو ناندێنەکە ڕۆیشت.

دەرگەی ژووری خەوتـــنەکەی نیـــوەکراوە بـــوو، جێگەکەی هەڵنەگرتبووەوە، تا ئەو ساتە نەمدیبوو نوێنی هۆڵەندییەک هێندە شپڕێو بێ. وێنەیەکی دایکی لە سەر مێزێکـی تەنیشـت قەرەوێـڵەکەی دانرابـوو، لە کاتێکـدا بەرەو ناندێنەکە دەچووم گوتم:

- دایکت چۆنە؟

- جارجارە باشە، جارجارە خراپ.

- مەبەستت چییە؟

- تا ڕادەیەک باشە.
- لە کوێ دەژی؟
- لێرە.
- ئێ! لە **گرۆنینگ** دەژی؟ لێرە چ دەکا؟
- هیچ.
- بەتەنیا دەژی؟
- نەخێر، چیتر بەتەنیا ناژی. ئێستا پیاوێکی تر لە ماڵەکەی دەژی، پێم وابێ پیاوێکی باشە.
- لە چ ڕوانگەیەکەوە؟
- دوو سێ جار بینیومە. ئەوەی ڕاستی بێ نایناسم، بەڵام دایکم گوتی پیاوێکی باشە، کە تا ڕادەیەک ئارامیی پێ بەخشیوە.

لەپڕێکدا ڕووی لە من کرد و گوتی: "سەرم سووڕماوە! ئەم هۆڵەندییە لە کوێ فێر بووی؟ بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو لەو زمانەدا پێش کەوتووی!"

نیگام ڕاشکاوانە لە سەر دوگمەکانی بلووزەکەی ئەبڵەق مابوو، ئەوەندە زەق کە دەستی ڕاستی لە سەر سینگی دانا. دڵم هۆشداریی پێ دام کە کاتی ئەوەیە بڕۆم. هەوڵم دا بۆی شی بکەمەوە چەند شێلگیرانە خووم داوەتە فێربوونی زمان، بەڵام دوگمە بچووکەکان کە لە نێو مەمکەکانیدا جموجوڵیان بوو، گشت ئەو ڕستە هۆڵەندییانەیان دەشێواند کە دەمویست پێکیان

بینم. نیگام وەردەگێڕا. ناشیانە قسەم بردە سەر ڕۆنی، بەلام ئەو دەمێک بوو لە یادەوەرییەکانم کۆچی کردبوو.
لێم پرسی:
- ئێستاکە خەریکی چیت؟ خوێندنی دواناوەندیت تەواو کردووە؟
- نەخێر، نەمتوانی تا کۆتایی بچم.
- ئەی ئێستا چ دەکەی؟
- هیچ. جارجارە بە ئیشێکی بچووکەوە سەرقاڵ دەبم.
کوپێک قاوەی بۆ ڕاداشتم. دەستە نەرمەکەی وە قامکەکانم کەوتن، گەرما جەستەی تەنیم. ئەو چیتر میەترا نەبوو، بەڵکو کەلێنێکی شاراوە بوو لە هەلاتنی من، کە ئەو حەوت دوگمە بچووکە پێکەیشتنیان مەحاڵ کردبوو.
دەبوایە چ بکەم؟ پشتی تێ بکەم؟ کەند و لەندەکان تێک بشکێنم؟
"بیکەرەوە! بیکەرەوە! ئاستەنگەکان تێک بشکێنە!"
"نا نا، مەیکەرەوە، ئاستەنگەکان تێک مەشکێنە."

## ٢٨

دەبوایە چاوم بە کەسێکی تر کەوتبایە؛ پیاوی نوێی نێو ژیـانی هاوســەرە کـۆنەکەی **ڕۆنــیّ**، **میرانــدا** مەراقــی وروژاندبووم.

درەنگـانی شــەو بە ناونیشـانێکەوە بینـاکەی **میرانـدام** جێهێشـت، بەدوی مـاڵی **ئانێک**ەوە بەرەو ناوەنـدی شـار هەنگاوم نا.

بە نێـو گەڕەکە تەنگەکـانی نێـو مـاڵە نزمەکـان بەدوای ژمـــــارەی دەرگەکەدا دەگەڕام. لێـــــرەولەویّ پیـــــاوی سەرخۆش بەدی دەکران. من سـەرخۆش نەبووم، بەڵام تەواو بەسەر چۆکەکانمدا زاڵ نەبووم.

لە گەڕەکێکـی تەنـگەبەری شــوێنێکی چەپەر مــاڵەکەم دۆزیــیەوە. پەردەکـــان دادرابـــوونەوە، بەڵام نـــاوەوە ڕووناک بوو. گوێم ڕاداشت تـاکو بزانم گوێم لە دەنگی کەسێک دەبیّ یـان نـا، جووڵەیەک نەدەبیسـترا. بێدەنگی بەسـەر ئەو نـاوەدا زاڵ ببـوو، بە هێمنـی لە دەرگەم دا. مـاوەیەک چـاوەڕێم کـرد، پاشـان هەمـدیس لە دەرگەم دایەوە. پەردەکە لا درا، ڕوخسـاری ژنێـک بەدەر کەوت. سەیری کردم، شەپقەکەم لابرد و درێدۆنگانە ڕاموەشاند.

پەردەکە دادرایەوە. ساتێک دواتر ژنێک لە پشت دەرگەوە پرسی:

- کێیە؟

- منم، **بولفەزل**.

- **بولفەزل**؟ **بولفەزل** کێیە؟

- جیرانەکەی **ڕۆنێ**، کۆنە جیرانەکەی **ڕۆنێ**.

- ئەها! **بولفەزل**.

دەرگەکە کرایەوە.

گوتم:

- ئێوارەباش.

- بەو نیوەشەوە لە بەر دەرگەی ماڵەکەی من چ دەکەی **بولفەزل**؟

لەگەڵ ئەم قسانەدا بۆنی کحول وە ڕوخسارم کەوت.

ئەو ناونیشانەم پێ پیشان دا کە بە خەتی **میراندا** نووسرابوو.

"**میراندا** پێی گوتم دەتوانم سەرێکتان لێ بدەم. یەک دوو جار تەلەفۆنی بۆ کردن، بەڵام لە ماڵ نەبوون. لەگەڵ ئەوەشدا بە هەڵکەوت هاتم."

سەرخۆشانە گوتی:

- ئەم ئێوارە هەر لە ماڵ بووم. تەلەفۆنەکەم لەکار کەوتووە، پشیلەکە تێکی داوە. فەرموون. کەواتە لای **میراندا** بوون؟

- بەڵێ، چووم بۆ دیدەنی.

- فەرموو تکایە. خۆشحاڵت کردم، بەخێر بێی.

وە ژوور کەوتم.

"چاکەتەکەت دابنێ."

ماڵەکە کۆن و بچووک و شپرێو بوو، مۆمێک سێبەری سەرجەم کەلوپەلەکانی درێژ کردبووەوە. چەند وێنەیەک بە دیوارەوە هەڵواسرابوون؛ بەدوای وێنەیەکی ڕۆنیدا وێڵ بووم، چونکە پێم وا بوو دەبێ وێنەیەکی بە دیوارەوە بێ، وایش بوو. وێنەیەکی ڕەنگی ڕۆنی لە سەرووی زۆپاکە، لە نێو تاریکیدا دەبینرا. بە ئاستەم ڕوخساریم بۆ هەڵدەدرا، نزیک بوومەوە بۆ ئەوەی باشتر بیبینم.

چینێک تەپوتۆز گنجەکانی دەموچاوی داپۆشیبوو؛ لە بن دارهەڵووژەکە دانیشتبوو، کە بچووکتر لەو دارە بوو وا من بینیبووم. کەسک بوو، کەسک بووە و بەرەبەرە خۆڵەمێشی هەڵگەڕاوە و پاشان ون بووە .

ئانێک گوتی:

- بەڕاستی خۆشحاڵم کە هاتووی، قەت چاوەڕێ نەبووم. چاکەتەکەت بەو شوێنەوە هەڵواسە کە پێت خۆشە.

- هەق بە تۆیە، کتوپڕ بوو. ئەوەی ڕاستی بێ پێم خۆش بوو دیدارێک تازە بکەمەوە. چۆن بڵێم، بە جۆرێک دەمویست چاو بە هەموو ئەو شتانەدا بخشێنمەوە کە ئەمساڵانەی دوایی بینیومن. ئاخۆ قسەکانم ڕوونن؟ خۆم وەک کەسێک دێتە بەر چاو کە پاش خەوێکی شەش حەوت ساڵە ڕا دەبێ. لەو

ساتەوەختەوەی توانیومە هەندێک زمانەکەم وە ڕێ بخەم، هەستم کردووە دەبێ هەمووتان ببینمەوە.

ئەو گوێی لە من نەبوو، زۆری خواردبوووەوە، نەیدەتوانی قسەکانی من بشۆپێنێ.

گوتی:

- دانیشە. چ دەخۆیتەوە؟

- چ دەخۆمەوە؟ من زۆر ناخۆمەوە، بەڵام ئەمشەو زیاتر لە جاران خواردومەتەوە. بەس حەزم کرد سەرێکت لێ بدەم. پاشان دەمویست بە دوایین شەمەندەفەر بچمەوە، بەڵام پێم وابێ دوایین شەمەندەفەر دەمێکە ڕۆیشتووە.

- دەبێ بچیتە کوێ؟

- ماڵی خۆمان.

- ئەها، جا پەلەی چیتە. بە شەمەندەفەری سبەی بەیانی بڕۆرەوە.

- بیرێکی چاکە. زۆر باشە، دەخۆمەوە. ئەمشەو هەموو مافێکم هەیە، دەتوانم بوتڵێک بەتاڵ بکەم. لەگەڵ دەرکەوتنی خۆردا سواری شەمەندەفەر دەبم.

چەند تابلۆیەک بە دیوارەوە هەڵواسرابوون. جانتایەک لە سەر تابلۆیەک کێشرابووەوە، بەڵام نەمزانی ئاخۆ جانتاکە هی کەسێکە کە لە سەفەر گەڕاوەتەوە، یان هی کەسێکە کەوا سەفەرێکی دووروودرێژی لە بەرە. لە تابلۆیەکی تردا ڕەشەبایەک خرابووە بەر چاو، ڕەشەبایەک کە کۆمەڵێک جلی شەکاندبووەوە. هەندێک

له جله‌کان به‌سه‌ر ئه‌رزدا ده‌خووشین، وه‌ک ئه‌وه‌ی با له بیری چووبێ له‌گه‌ڵ خۆیدا بیانبا، یان ڕه‌نگه ئه‌و ڕووناکییه کزه بێ که وای ده‌کرد به جۆرێکی تر تابلۆکه ببینم؛ ده‌تگوت نیگارکێش کاره‌که‌ی به نیوه‌چڵی جێ هێشتووه بۆ ئه‌وه‌ی کار له سه‌ر تابلۆیه‌کی دیکه بکا، یان ڕه‌نگه وه‌ک **ڕۆنێ** مژاری تابلۆکه‌ی فه‌رامۆش کردبێ.

- ئه‌م تابلۆیانه هی کێن؟

- هیی من نین، هیی **هه‌نک**ن.

- **هه‌نک**؟

- **هه‌نک ڤان ده‌ر هۆرست**، له زستانی پاره‌وه له‌گه‌ڵ من ده‌ژی.

- **میراندا** پێی گوتم که براده‌رێکی نوێت هه‌یه، یانی هاوڕێیه‌کی نوێ، مه‌به‌ستم ئه‌وه‌یه بڵێم دیسان له‌گه‌ڵ که‌سێکی دیکه‌دا ده‌ژی. ئاخۆ وایه؟

- به‌ڵێ، که لێره‌یه به‌خته‌وه‌رم.

پێکێک ئاره‌قی **یه‌نیڤێری** بۆ ڕاداشتم.

"ئه‌مه چییه؟ **یه‌نیڤێری**کی نوێ یان هیی کۆن؟" دیاره هه‌رگیز له جیاوازیی نێوان ئه‌م دوانه نه‌ده‌گه‌یشتم.

گوتی:

- کۆنه، هه‌نک حه‌زی له **یه‌نیڤێری** کۆنه. ئێستا خه‌ریکی به چی؟

- خه‌ریک به چیم؟ له گه‌نجینه‌ی شاره‌وانی کار ده‌که‌م، به ئه‌رشیڤی کۆنه‌وه سه‌رقاڵم.

- دڵت بە کارەکەت خۆشە؟

- دڵم پێی خۆشە؟ نازانم. بەڵام شوێنێکی ئارامە، بە دەگمەن کەسێک ڕووی تێ دەکا. بە درێژایی ڕۆژ تەنیام، بۆ من دەرفەتێکی زێڕینە بگەڕێمەوە بۆ ڕابردووم. لەم نێوانەدا شیعری هۆڵەندی لە بەر دەکەم.

- چیت گوت؟ چی لە بەر دەکەی؟

- هیچ، گوێی مەدەیە.

لە دەرگەیان دا، دەرگەکە کرایەوە.

پیاوێک وە ژوور کەوت، پیاوێکی تەمەن دەوروبەری چل ساڵ بە ڕیشی پرۆفیسۆرییەوە، تابلۆیەکی لە بن هەنگڵ دابوو.

- **هەنک**، میوانمان هەیە. با **بولفەزل**ت پێ بناسێنم، هاوڕێ و جیرانی **ڕۆنێ**.

- ئەها، بەڵێ، **بولفەزل**.

تابلۆکەی لە نێو تاریکیدا بە دیوارەکەوە هەڵپەسارد و دەستی لەگەڵ لێدامەوە.

**ئانێک** پەرداخێکی بچووکی پێ دا. پاشان دانیشت، لاقەکانی لە سەر مێزەکە دانا و تەلەڤیزیۆنەکەی هەڵکرد.

**هەنک** پەرداخەکەی من و خۆیشی تەژی کرد.

پەرداخەکەی بەرز کردەوە و گوتی: "کەواتە تۆ ئەو **بولفەزل**ەی کە **ڕۆنێ** بەردەوام باسی دەکرد." لەگەڵ ئەو پیاوەدا هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد، بۆ من کەسێکی بیانی نەبوو، گەلێک شتی سەبارەت بە من دەزانی. کۆمەڵێک بوویەر و ڕووداو کە خۆم لەبیرم

چووبـوونەوە، نەک بلێـی لە بیـرم چـووبنەوە، بەڵام لەو ســــاتەوەختەدا چـــاوەڕێم نەدەکـــرد لە زاری ئەوەوە چیرۆکی ژیـانی خـۆم ببیستم. ئەو بەسـەرهاتی دایکـم و ئەو سەربوردانەی دەزانین کە بۆ ڕۆنـیم گێرابـوونەوە، دەیزانـــی چەنـــدین هەفـــتە لە قەراغ **ئەیســـێل** لە لای وەرزێرەکـــان کـــارم کـــردووە، هەروەهـــا چیرۆکـــی پیاوەکـانی مـاڵی مە و شــەمەندەفەرەکانی دەزانــی. لــێ ســـەبارەت بە بـــوتڵە بەتاڵەکـــان و ســـەفەری بـــوتڵە بەتاڵەکان هیچی نەدەزانی.

مـن کۆمەڵێـک سەرگوزشـتەی نـوێم بـۆ گێـڕایەوە و پـێکەوە **یەنیڤێـرە** کۆنەکەمـان خـواردەوە، ئەوەنـدەمان خـــواردەوە کە چیتـــر نەمانـــدەتوانی خـــۆ لە ســـەر پـــێ ڕابگرین.

لەناکاو لە سووچێکی تاریکی ژوورەکە، دوو چاو وەک دوو گەوهەر بریقەیان هات. باش نەمدەبینی چییە و وام دەزانـــی پشـــیلەیە لە ســـەر قەنەفەیەک پـــاڵ کەوتـــووە. هەنگاوێـک چـوومە پێشـــەوە و بە ســـەرنجەوە ڕوانـــیم، قەفەزێـک بە بنمـــیچەوە هەڵواســـرابوو. مەلێـک بە دەم باڵەفرکێوە دەیجریواند: "ئوا، ئوا، ئووید، ئووید."

سەرخۆشانە دەنگم هەڵبڕی: "مرد، مرد. تووتی مرد."

**هەنـــک** بە سەرســـووڕمانەوە گـــوتی: "ئەوە باســـی چ دەکەی؟"

تووتییەکە دووبارەی کردەوە: "ئوا، ئوا، ئووید، ئووید."

**هەنک** گوتی: "کاتی خەوە. بنوو!"

**ئانێک** لە پای تەلەڤزیۆنەکە خەوی لێ کەوتبوو.

**هەنک** گوتی: "میوانداریییەکی سەیرە. ئەوە خەوتووی **ئانێک**؟"

تووتییەکە ساتێک چاوی تێبڕیم، پاشان دوو گەوهەرەکە لە نێو تاریکیدا کووژانەوە.

**هەنک** ئامـاژەی بە شـەپقەکەم کـرد، کە لە ژوور مێزەکەوە هەڵواسرابوو و گوتی:

- ئەمە هیی تۆیە؟

- بەڵێ، هیی منە.

- بیکە سەرت و دابنیشە. ئاخۆ جارێ دەبی ئەگەر پۆرترەکەت بکێشمەوە؟

نارەزاییم دەرنەبڕی، ئەوە کۆچ و هەڵاتن بوو. من، **بولفەزل**، درێژکراوەیەکی مەنفا بووم. ئێستا کەسێک لە سەر پارچەی تابلۆیەک دەمنەخشێنێ.

لە سەر کورسییەک دانیشتم، **هەنک** تابلۆیەکی نوێی خستە بان سێپایەکەوە.

سالانێک لەمەوپێش، یەکەم کتێبم سەبارەت بە کوردەکان نووسی. کتێبێک لە ژێر سەردێڕی "کوردەکان دەڵێن چی؟" لەوێدا باسی خۆشی و خەم و خەباتی کوردەکانم کردووە. هەموو شوێنێکی کوردستانی ئێران گەڕاوم و دڵی تینووم بە سۆز و میوانپەروەری کوردەکان تێر بووە.

ئێستا گەلێک ساڵە وەك هەزاران کوردی ئێرانی، عێراقی، سووریایی و تورکیایی، لە دەرەوەی نیشتیمانەکەم دەژیم. لە ڕێگەی ئەم کتێبەوە کە کراوەتە کوردی، جارێکی دی سڵاوی خۆمتان ئاراستە دەکەم.

هەروەها دەبێ بڵێم ناوی من، قادر عەبدوڵڵا، لە ناوی دوو هاوڕێی کوردم کە گوللەباران کران، وەرگیراوە.

من لە ڕێگەی دۆست و هاوڕێیانم و هاوسەرەکەمەوە بە کوردستانەوە پەیوەند دراوم. لە دی ئێن ئەی کچەکانمدا فەرهەنگ و ئاوازی کوردی هەیە، چونکە باوەگەورەیان خەڵکی کوردستانە.

قادر عەبدوڵڵا

غەزەلنووس